ڕۆمان

# ویل ٧٧

بەدوای کچانی ئەنفالکراوی فرۆشراو بە میسر

سەدرەدین سەیفەدین کەلهوڕی

چاپی دووەم
2010

# وێڵ

## بە دوای کچانی ئەنفالکراویی فرۆشراو بە میسر

ڕۆمان

نووسینی/ سەدرەدین محێدین کەڵوپیی

چاپی دووەم

(٢٧٠٩ی کوردیی - ٢٠١٠ی زایینیی)

## ناسنامەی کتێب:

- ناوی کتێب/ وێڵ
- بابەت/ ڕۆمان
- نووسینی/ سەدرەدین محێدین کەڵوڕیی
- شوێنی چاپ/ چاپەمەنی گەنج
- ژمارەی سپاردن (٤٢٦)ی ساڵی ٢٠٠٧ ی وەزارەتی ڕۆشنبیریی پێدراوە.

# (١)

به تەنیایی لە ژوورەکەم ڕاهاتبووم،هەمیشە لەگەڵ ئەندێشە هاوڕێ بووم،پتریش دەچوومە نێو قوڵایی دەریای خەیاڵەوە کاتێ پێکێ ویسکیم هەڵدایە،دەمویست بە خواردنەوە و هەڵدانی چەن پێکێ ، ئازار و خەمەکانم فریوبدەم،بەڵام ئازارەکان هێند بە هێز وکاریگەر بوون فریویان دابووم،لەگەڵ هەڵدانی هەر پێکێ هاوبەشییاندەکرد و ئاڵودەی خوێنم ببوون،بە شادەمارەکانم دەسوڕانەوە ،فرمێسکیان لە نێو دڵ و مێشکوچاو هەڵدەقوڵان و دەباران.ئەو ئازار و خەمانە چۆن منیان تەزانبوو،بەو شێوەیەش دایکیان ئازاردەدام،ئەویش لە ژوورە تایبەتەکەی بە زیکر و نوێژکردن و پاڕانەوە لە خوای میهرەبان،دڵی خۆی هێوردەکردەوە ،ئازار و خەمەکانی بەو خوا پەرستییە کەم دەکردەوە.

ئەو ئێوارەیە لە ژوورەکەی دایکم پێکەوە نانمان دەخوارد،دایکم چاکەی خستە سەر سەماوەرەکە،گوتی: کوڕەکەم نەڕۆیت،چاوەڕوان بە تا دوو ڕکات نوێژ دەکەم،با لە پاش نانخواردنەکە چایێ شیرینت بۆ تێبکەم. دڵیم نەشکاند،تا دوا ڕکات نوێژی تەواوکرد لە چاوەڕوانیبووم،هەستم لای دەنگە بە سۆزەکەی بوو،دەسەکانی بەرزکردبووەوە، بە دەنگێ بە سۆز،بە قوڕگێکی پەنگخواردووی گریانێ، بە چاوێکی قەتیس ماو لە فرمێسکی گەش،دەپاڕایەوە لە خوای

میهرەبان و دەیگوت:(خوایە گیان ئابڕووی کچەکانم لە دەس زاڵمان بپارێزی، لەگەڵ هەموو ئەو کچانەی کە لە ژێر دەسی دوژمن و چاوچنۆکانن،خوایە گیان مێردەکەم پارێزراو بێ لەگەڵ هەموو پیر و پەککەوتەکان،ژن ،مندالآن ، کوڕان و کچان، هەموو بێتاوانن،تاوانیان نییە، بە چاکەی خۆیانیان لەگەڵ بکە،لە نێو کارەساتی مەرگ،کارەساتی ئەنفال ڕزگاریان بکە).سەری داخست،بە هێمنی دەگریا،چەن دڵۆپێ لە فرمێسکە گەشەکانی بە لەچکەکەی سڕییەوە،هەناسەیەکی هەڵکێشا،سەری هەڵبڕی و گوتی:خوایە گیان تۆڵەمان لەو دڕندانە بسێنە، ئەم کوڕەم بپارێزی کە لەو هەموو کەسوکارەم تەنیا ئەم شکدەبەم،بیهێنە سەر ڕێی ڕاست،بە خراپەی ئەم نەکەی، ئابڕووی کچانمان لەگەڵ کچی هەموو کوردمان بپارێزی.

زۆر گریانم بۆ دایکم دەهات کە بەو شێوەیە لە خوا دەپاڕایەوە، پاڕانەوەکەی زۆر دڵتەنگیدەکردم،بەزەیی دەخستە نێو دڵمەوە،تەنانەت فرمێسکی لە چاوانم دەردەهێنا،حەزم نەدەکرد بەو شێوەیەو بەو کوڕوزانەوەیە لە خوا بپاڕێتەوە،گوتم:(خوایە گیان دڵی دایکم مەشکێنە و داواکاریەکەی بەجێبێنە)،ڕووم کردە دایکم و گوتم:دایە گیان، بەسیەتی هێند مەپاڕێوە. بە دەم ئایەت خوێندنەوە بەرماڵەکەی هەڵگرت و هات بەرەو لای سەماوەرەکە ، بە ئایەت خوێندنەوە دەمی دەجولا،کە تەواو بوو گوتی:کوڕەکەم وا مەڵێ، ئێمە هەر دەبێ لە خوا بپاڕێینەوە ئەنفالکراوانمان بپارێزێ.

گوتم:دایە گیان کە بەم شێوەیە دەتبینم لە خوا دەپاڕێیتەوە،پێم ناخۆشە و ئازار دەچێژم،چونکە تۆ لای من کەسێکی زۆر میهرەبانی. گوتی:کوڕەکەم قسەی وا مەکە،ئەو قسانەت بۆن کفری لێدێ، ئێمە خوا

دروستیکردووین، دەبیّ بۆ هەموو شتیّ لیّیبپاڕیینەوە و نزا بکەین تا داواکارییەکانمان جیّبەجیّبکات.

گوتم:دایکە گیان،وا بۆ پازدە سالّ دەچیّ تۆ لە خوا دەپاڕیّیتەوە تا چارەنووسی خوشکەکانم،باوکم، کەسەکانمان،دەربکەویّ، کەچی هەر وا چاوەڕوانین،زۆرمان لیّیداواکرد،بەلاّم کوا ؟!!.

دایکم گوتی:کوڕەکەم گەر منت خۆشدەویّ،جاریّکی دی قسەی وا ناکەی، خوا زۆر بە هیّمنی و شیّنەیی نزاکانی بەندەی خۆی جیّبەجیّ دەکات، بەلاّم ئیّمەی بەندە زۆر پەلەمانە، هیچی دی مەلّیّ، با چایەکەت بۆ تیّکەم و بچۆرەوە ژوورەکەی خۆت.بە پەلە هەستام دەسیم ماچکرد ،سەریم ماچکرد.گوتم:توخوا دایکە گیان لیّم زویرنەبی.

گوتی: تۆبە بکە، بلّیّ خوایە گیان تۆبە.

گوتم: خوایە گیان تۆبە،دایکە ئیّستە دلّت چاکبوو، بە ڕوویەکیگەشەوە گوتی:کوڕم،خوای خۆت لە بیر مەکە هەموو شتیّ ئەو چارەسەریدەکات.

گوتم:دایە گیان زۆر ڕاسدەکەی،تەماشای چاوەکانیم کرد و گوتم: ئەم جارەش تۆبە.

گوتی:وا بیّ فەرموو ئەم چایەش بخۆرەوە.

لە پاش چا خواردنەوەکە، شەو باشم لیّکرد و دووبارە دەسیم ماچکردەوە گوتم: من بە خوات دەسپیّرم.گوتی: شەوت هەر شادبیّ، خوا بتپاریّزیّ.

## (٢)

ئەو شەوە، وەك شەوەكانی دی مێزەكەم بە وێسكی و بیرە و مەزەی جۆراوجۆر ڕازانەوە،پاكەتێ جگەرەی جۆری (مۆر)یشم لە سوچێكی مێزەكە دانا، سەیری دەرەوەم كرد بزانم ئایا دایكم نوستووە یا نەنوستووە،بەڵام هێشتا هەر نەنوستبوو،چاوەڕوانبووم بنوێ،پاشان دەسبكەم بە خواردنەوە،حەزم نەدەكرد بزانێ دەخۆمەوە، چونكە گەر بیزانیایە ئازاری دەچەژت و بە ڕاستی لێم زویردەبوو،لەبەر ئەوە تا شەو درەنگیكرد هەر چاوەڕوانبووم،لە كونی دەرگاكەیەوە تەماشام كرد، لە سەر بەرماڵەكەی زیكریدەكرد ولە خوا دەپاڕایەوە،زانیم بەم زووانە نانوێ و ئاگای لە منیش نییە،هەر بۆیە دەسم كرد بە خواردنەوە.

خۆ من حەزم دەكرد بە قسەی دایكم بكەم و هیواكەی بێنمە دی كە زۆرجار دەیگوت كوڕم ژن بێنە با منداڵەكانت ببینم ،پاشان بمرم كێشە نییە.بەڵام چونكە ئازارەكانم زۆربوون،خەمەكان لە یەخەم نابوونەوە، نەمدەویست بچمە فەرمانگە وهاواربكەم، لە ناخی دڵەوە بڵێم (ئەوین) گیان تۆم خۆشدەوێ،دێم بۆلای دایك و براكانت داخوازیت دەكەم،بەڵام ئاخ،هیوای دۆزینەوە وچارەنووسیی دوو خوشكە ئەنفالكراوەكەم، ئازاری چاوەڕوانیی كەسەكانم،ئێجگار بە هێز و كاریگەرتربوون،ببووە هیوای یەكەمی ژیانم ولەگەڵ هەڵدانی هەر پێكێ دەنگی هاواری

خوشــکەکانم بــە دەســی جەللادەکانــەوە ،دەنگــی منــدالّ ،ژن ، پــیر و پەککەوتە، دەبوونە مۆسیقایی دلّتەزێنیی بێوێنە،بە خوڕ فرمێسکی لە چاوانم دەردەهێنا،بەو شێوەیە شەوانەم بە سەر دەبرد و خواردنەوەش باشترین هاوڕێی شەوانەم بوو. نەمدەویست ئەو (ئەوین)ەی لە ناخی دڵەوە ئاهم بۆ هەڵدەکێشا و خۆشمدەویست،بیکەمە هاوسەر و لەگەڵ ئازار وخەمەکانم هاوبەشبێ.بەلاّم هەر خۆم گوتم:پێویستە بە زووترین کات چارەنووسی ئەنفالکراوان بزانم، هەر نەبێ چارەنووسی ئەو هەژدە کچە کوردە ئەنفالکراوەی فرۆشراون بە (میسر)،کێ دەڵێ هەر دوو خوشکمی تێدا نییە؟!! لە پڕ وورەم بەرزبووەوە،گوتم ئەمە کاری زۆرباشە،بەلاّم بە کێ بڵێم؟پێکێ دیکەم هەڵدا،بیرکردنەوە پتر مێشکی خەریککردبووم،گوتم:باشە من لە فەرمانگەیێ کاردەکەم تایبەت بە مافی مرۆڤ،سەرۆکی بەشێکی گرنگی مافیی مرۆڤم ،لە هەمووی گرنگتر دەرچووی کۆلێژیی توێژەری کۆمەلاّیەتییم،وا چاکە هەر سبەینێ راپۆرتێ بنووسم و داوای لیژنەیێ تایبەت بکەم بۆ بە دواداچوونی چارەنووسیی ئەنفالکراوان،لە هەموو گرنگتر ئەو کچە پاکوبێگەردانەی (میسر)،خۆ من هەموو ڕۆژێ کە دەچمە فەرمانگەکەم،پێش هەموو شتێ چەن تابلۆیێ هەڵواسراو لە ئەنفالکراوان وکیمیاباران وچەندین کارەساتی دڵتەزێنی دیکە بە دیواری فەرمانگەکەوە دەبینم،جگە لەو لەوحە گەورەیەی پرەنسیپەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان تایبەت بە مافی مرۆڤیی لە سەر نووسراوە، کە بە تەواوی دەیشێوانم و ئازاریدەدام و بە دڵێکی پڕ نائارامییەوە دەچوومە ژوورەکەم ،بەو بەیانییە بە خەیاڵی ناخۆشەوە ئەو ڕۆژەم بە سەر دەبرد،بەلاّم ئەوەی کەمێ لە خەموئازارەکانی ڕادەماڵییم،هاتنی (ئەوین) بوو بۆ ژوورەکەم،زۆر شتی

لە بیر دەبردمەوە،جوانیی بێوێنە بوو.هەستمدەکرد لە ناخی دڵەوە خۆشمدەویست وخۆشیدەویستم، زۆرجار سەردانی دەکردین،لەگەڵ دایکم پێوەندییان زۆرخۆشبوو.باسی زۆر شتی بۆ دەکردم،تێر نەدەبووم لە قسە ناسکوخۆشەکانی،بەو زەردەخەنەیەی هێند کاریگەربوو،چەن جارێ ڕەنگی دەگۆڕانم،بە چاوەکانی دڵی ئاودەدام،ئازارەکانی لێ دوور دەخستمەوە،جاروبار دەمویست بڵێم (ئەوین گیان تۆم خۆشدەوێ، چییدەڵێی گەر بێم بۆلای دایك و براکانت داوات بکەم،تۆ تاقانەی لەماڵەوەتان منیش بە تاقانەیی لەگەڵ دایکم دەژیم)، بەلام کە بیرم دەکردەوە،دەترسام ئەویش تووشی ئازاربکەم و ببێتە هاوبەشی خەمەکانم،ئەوسا ژیانی ببێتە دۆزەخ،من گەر ئەوم خۆشبوێ،هەرکە خەموئازارەکانم کۆتایی پێهات،زۆر بە ئاسانی تێیدەگەیەنم و ئەوسا دەبینە خۆشەویسترین هاوسەر و بەختەوەرترین خێزان.هەر بۆیە کە دەمبینی نەمدەتوانی بڵێم تۆم خۆشدەوێ،بەلام لە ناخەوە شەیداییمان لە بۆ یەکدی بێسنووربوو.لەم خەیالانەدا بووم،دایکم لە دەرەوە بانگی کردم و گوتی: کوڕەکەم تا ئێستە نەنوستووی؟!!.

گوتم: دایکە گیان نەنووستووم،خەریکی مامەڵەکانی فەرمانگەم.

گوتی:کوڕەکەم بۆ هەموو ڕۆژێ مامەڵەکان بۆ ماڵ دێنی؟ بۆ هەر لە فەرمانگە واژۆی ناکەی، هەموو شەو تا درەنگ هەر خەریکی و خۆت ماندوودەکەی.

گوتم: دایکە گیان فریا ناکەوم، بەلام تۆ بۆ نەنوستووی؟.

گوتی: من وا دەچم دەنووم، شەوت شاد.

گوتم: شەوت شاد دایکە گیان.

دڵم خۆشبوو کە نەیگوت دەرگاکەم لێبکەوە.یەکسەر پێکێکی دیم هەڵدا وگوتم:(دەبێ ڕۆژێ بێ و خوشکەکانم ببینمەوە،چارەنووسی ۱۸۲۰۰۰ ئەنفالکراو ئاشکرا بێ و ئازار و خەمەکانم نەمێنێ،واز لە خواردنەوە بێنم،شەوانە لە بری خواردنەوە،لە چاوە پڕ لە عیشق وجوانییەکەی ئەوین تێر تەماشا بم، ببینە هاوسەر،خۆشەویستی بە جوانترین ماچی عیشقبازی بگۆڕینەوە). ئەو خەیاڵەی لەگەڵ (ئەوین)دا و لە دیمەنێکی قەشەنگ دەمبینییەوە، هانیدەدام بە زووترین کات هەوڵدەم بۆ پێشنیازکردنی لیژنەی بە دواداچوونی چارەنووسیی ئەنفالکراوان، لە پێشنیازەکەشدا ئامادەیی خۆم دەردەبڕم تا ببمە یەکەمین کەس بۆ هەرشوێنێکم بنێرن بۆ بەدواداچوون لە دۆزینەوەی چارەنووسی ئەنفالەکانمان،گەر گوتیشیان یەکێ تەرخاندەکەین بۆ میسر،خۆم تەرخاندەکەم و بۆ ئەوەی هیوای یەکەمم بە زووترین کات بە دەس بێنم و ئەوسا ئەوین دەبێتە ئەو پەرییەی کە هەمیشە خەونی پێوە دەبینم و دەبینە گیانێ لە دوو جەستەی پاك،ئەو کات هیوای دایکمیش دێتە دی.حەزمدەکرد زوو شەو بڕوات و بگەمە فەرمانگەکەمان ئەو پێشنیازە بگەیەنمە بەڕێوەبەری گشتیی فەرمانگە و لە پاشان بە دەسەکانی خۆم بیگەیەنمە وەزیری مافیی مرۆڤ و هەر خۆم بە جەنابی وەزیر بڵێم ئامادەییم تێدایە بۆ هەر شوێنێ بتانەوێ بمنێرن،بە تایبەت بۆ وولاتی میسر،کە چەندین ساڵە بیستوومانە ولە لیستێکدا ئاشکرابووە،(هەژدە کچ) لە جوانترین کچانی ئەنفالکراومان فرۆشراون بەو وولاتە،ئێستە ئەوان هەر لە چاوەڕوانییدان، ئێمەش لەم هەلە زێڕینەی ئەوڕۆ هەیە، لەم ئازادییەی عێراق و لە ناوچوونی ڕژێمی سەدامی دیکتاتۆر،لە سەرووی هەموویانەوە کاربەدەستی کوردمان لە

نێو پایتەختی عێراق باشترین جێیان هەیە،باشترمان دەسناکەوێ،نابێ ئەم هەلە لە دەسبدەین،دەبێ هەوڵدەین ڕۆژێ زووتر بیانهێنینەوە،لە چاوەڕوانیی پازدە ساڵەیان ڕزگاربکەین.هیوام خواست هەر لە بەیانی زووتر نییە، دەبێ هەوڵی بۆ بدەم و خۆشی لە دڵم بڕوێنم.

(۳)

بەیانی زوو لە خەو هەستام ، ئۆتۆمبیلە خنجیلەکەم خستە ئیش و چووم بەرەو فەرمانگە، کە نزیک بوومەوە بیرم لە ئەوین دەکردەوە نایبینم، چونکە سێ رۆژ مۆڵەتی وەرگرتووە،خۆشەویستیی ئەوین وایلێکردم بە پەلە بم لە بیرۆکەکەی شەوم، هەر ئەوڕۆ بە زوویی راپۆرتێ بگەیەنمە بەڕێوەبەری گشتیی فەرمانگە، تا بە زووترین کات لیژنەی بە دواداچوونی چارەنووسی ئەنفالکراوان دابمەزرێ و ئامادەیی خۆمیش پیشاندەم بۆ (میسر) تا زوو کارەکان ئەنجامدەین و فریای ئەوە بکەوم پاش ئەنجامدانی ئەم کارانە،دڵی دایکم خۆشکەم ،بچێ بۆ خوازبێنی ئەوین.ئەو ڕۆژە تا نیوەڕۆ بەو کارانەوە خەریکبووم و نووسراوێکی تایبەتم کرد ولە لایەن بەڕێوەبەری گشتیی لیژنەکەوە واژە کرا،تا بیگەیەنمە وەزیری ماق مرۆڤ،بۆ سبەینێ یەکسەر هەر لە ماڵەوە چووم بەرەو وەزارەت،چاوپێکەوتنم لەگەڵ جەنابی وەزیر ئەنجامدا،زۆرخۆشحاڵبوو ئێمە بتوانین ئەو بە دواداچوونە ئەنجامدەین، پتریش خۆشحاڵبوو کە من ئامادەیی خۆم تێدا بەیان کردبوو بۆ چوونە میسر،دەیگوت:دڵنیام دەتوانی بگەیتە ئەنجام، چونکە دڵسۆزانە دەتبینم بۆ ئەم کارە پیرۆزە،جگە لەوەش خۆت لە کەسوکاری ئەنفالکراوانیی.

منیش گوتم:ڕاستە من لە کەسوکاری ئەنفالکراوانم وهەست بە دەروونی کەسوکاری ئەنفالەکان دەکەم، بەڵام بە ئەرکێکی نیشتمان پەروەری دەزانم بەرانبەر گەلەکەم ئەنجامیدەم، من کە دەمەوێ بچم بۆ میسر،کێ دەڵێ هەردوو خوشکەکەم لەگەڵ ئەو کچانەن کە فرۆشراون بەو وولاتە، بەڵام بە ئەرکێکی پیرۆزی سەر شانی خۆمی دەزانم،چونکە ئەوانی دیکەش هەرخوشکی منن.

جەنابی وەزیر: ئەم بابەتە وئەم داواکارییە زۆرپیرۆزە، هەوڵدەدەم لە ئایندەیەکی زۆر نزیك لەگەڵ سەرۆکی کوردستان بودجەی تایبەتی بۆ دیاریکەین،بۆ ئەوەی تۆ دەسبەکاربی، بە شێوەیەکی نهێنیی کارەکە ئەنجامدەی و کچانمان لەو چاوەڕوانییە ڕزگاربکەی.

گوتم:من زۆر سوپاسی تۆ دەکەم کە بەو پەڕی دڵسۆزییەوە ئەم پێشنیازەمان جێبەجێدەکەی، هیوادارم لە وێنەت زۆربێ، با پتر لە کاتی جەنابتان نەگرم، ئێمە لە چاوەڕوانیی فەرمانی جەنابتانین. هەستام،ئەویش هەستا و تا دەرگای ژوورەکەی بە ڕێیکردم.

کە گەڕامەوە بۆ فەرمانگە و هەواڵەکەم گەیاند، هەموو دڵخۆشبووین کە پێشنیازەکەمان زۆر بە بەجێ و ڕەوا دانرابوو.چوومە ژوورەکەم، دانیشتم،هەستمکرد فەرمانگەکە چۆڵە،بۆشاییێ هەبوو کە تەنیا بە ئەوین پڕ دەبووەوە.لە دەرگا درا،تریفەخانی دەسەخوشکی ئەوین هاتە ژوورەوە،دڵم بەویش زۆرکرایەوە چونکە هاوڕێی خۆشەویسترین کەسم بوو،فەرمووی دانیشتنم لێکرد،گوتی:دانانیشم،بەڵام هاتووم بڵێم لە بەیانییەوە ئەوین چەن جارێ پێوەندیی بە منەوە کردووە،کاری بە تۆ هەبوو،دەیگوت بۆچی مۆبایلەکەی داخراوە.بە پەلە مۆبایلەکەم دەرهێنا و کردمەوە، گوتم: تریفەخان لای جەنابی وەزیر بووم بۆیە دامخستبوو.

گوتی: زۆر باشە کاك (بڕیار)،دە ئێستە بیکەوە، ئاگاداری ئەوین بە تۆی زۆر خۆشدەوێ.

گوتم: منیش زۆر خۆشمدەوێ.

ئەو ڕۆیشت،پاش کاتێکی کەم، زەنگی مۆبایلەکەم لێدرا، سەیرمکرد نوسرابوو ئەوین،دەسم دەلەرزی و نەمدەزانی چۆن پەنجە بنێم بە جێکردنەوەی مۆبایلەکە ،بە ڕاستی حەزمدەکرد لەگەڵ وەڵامدانەوە پڕ بە دڵ بڵێم( ئۆخەی،خۆشەویستم ئۆخەی، فەرموو چییت دەوێ تا جێبەجێی بکەم).

ئەوین گوتی: لە بەیانییەوە لەگەڵ کێی، بۆ وەڵامم نادەیتەوە.

یەکسەر زانیم توڕەبووە، غیرەی لێکردووم و دەترسا لەگەڵ کچی دیکە پێوەندییم هەبێ.

گوتم:ئەوین گیان،جارێ بەیانیت باش،داوای لێبوردن دەکەم، بەیانی لە ژووری جەنابی وەزیر بووم،بۆیە دامخستبوو،هێند دڵی خۆشکردم، کردنەوەی مۆبایلی لە بیر بردمەوە،کە هاتمەوە تریفەخان پێیگوتم ئەوین تەلەفۆنی بۆکردووی،بەڵام داتخستبوو.

هەستمدەکرد بێدەنگ گوێی لێرادەگرتم،لە پاش تەواو بوونم لە قسەکان.گوتی: کاك بڕیار، بۆچی بۆلای جەنابی وەزیر چووی.

گوتم:لیژنەیەکمان دامەزراندووە بۆ بە دواداچوونی ئەنفالەکان،جگە لەوەش پێشنیازم کردووە خۆم بۆ میسر بچم وچارەنووسی ئەو کچانەی بە میسر فرۆشراون یەکلایی بکەمەوە،بەڵکو بتوانم خوشکەکانم ببینمەوە،ئەوسا لە ئازارو خەمەکانی شەوانم ڕزگاردەبم.

هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە ساردییەکەوە گوتی:ئینشەڵڵا سەرکەوتوو دەبی، بەڵام دەبێ کەی کارەکانتان بۆ ئەنجامدەن؟.

گوتم: ئەوەیان نازانم، بەڵام دڵنیام هاوکارییمان دەکەن.

گوتی:کاك بڕیار،دایکم، تۆ و دایکتی بانگێشتی نانخواردنی ئێوارە کردووە،لە چاوەڕوانییداین.

گوتم:ئەوین گیان دایکت ماندوومەکە،بەڵام پێمبڵێ تەنیا بانگێشتەکە لە لایەن دایکتەوەیە؟.

بێدەنگبوو،دەیویست وەڵامێکی باش بدۆزێتەوە،گوتی: منیش حەزدەکەم هاوڕێیەکی خۆشەویستیی فەرمانگەکەم بانگێشتکەم، چونکە ئێوارێ تەنیا خۆم و دایکم لە ماڵداین،(هەرێم)ی برام چووە بۆ سنوور،کاڵاکانی گەیشتووە و دەیهێنێتەوە.ئێمەش لەم شارە تەنیا ئێوە بە نزیکترین کەسمان دەزانین.

گوتم:زۆر ڕاستە، بە چاوان،ئێوارێ بە ئۆتۆمبیلە خنجیلەکەم لەگەڵ دایکم دێین.

گوتی: ئێمە لە چاوەڕوانییداین، ئیدی بە خوات دەسپێرم.

گوتم:ئەوین گیان پەلەی ماڵاوابوونت چییە؟ من وا دەزانم ڕۆژانی مۆڵەتی تۆ دەبێتە دروسبوونی بۆشاییێ زۆر لە فەرمانگەکەمان، بە ڕاستی شوێنت دیارە.

گوتی:سوپاس، منیش کە دێم بۆ دەوام، ئۆتۆمبیلە خنجیلەکەت دەبینم لەبەر دەرگای فەرمانگە،هەست بەوە دەکەم خۆشیێ ڕووم تێدەکات.

گوتم:دڵ ئاوێنەی دڵە ئەوین گیان.گەر ڕاستی نێو دڵمت پێبڵێم، بڕوا ناکەی چەند خۆشمدەوێی.

گوتی: بڕیارگیان. (یەکەم جاری بوو بەو ووشە جوانە بانگم بکات و ووشەی کاکی لە بیرچێتەوە).

گوتم: بەڵێ گیان.

چەن ووشەیەکی پچڕ پچڕی دەربڕی بەلام تێنەگەیشتم،( زانیم بە ووشەی گیان کە دەریبڕی و لە پڕ بە زبانیدا هات وخۆشەویستییمان لە بۆ یەکدی، ووشەی (کاک)ی لە بیر بردبووەوە).

یەکسەر گوتم: گیانەکەم ئەوین، یەك ووشەت تێناگەم، هەستدەکەم شلەژابی.

گوتی: بۆچیی؟!!.

گوتم: دەزانی من تۆم زۆر خۆشدەوێ؟.

بێدەنگ، وەلامی نەبوو..

کە دووبارەم کردەوە، گوتی: منیش.

گوتم: تۆش چیی؟.

ئەمجارەیان بە چەن ووشەیەکی پاراو و جوانەوە گوتی:بڕیار گیان منیش تۆم خۆشدەوێ.

گوتم:تۆ بڵێی ئەوین گیان ڕۆژێ بێ،خۆشەویستییمان لە نێو کەژاوەی هاوسەرێتییدا بگۆڕینەوە؟.

گوتی: تۆ دەزانی.

هەناسەیەکم هەڵکێشا،جگەرەی سەر تەپڵەکەکەم کە دامگیرسانبوو و لە تەواو بووندا بوو،دەستم بۆ برد و دوو مژم لێدا،لەو کاتە ئەوین گوتی:بڕیار بۆ وەلام نادەیتەوە، ئەم هەموو ئاهو حەسرەتە چییە لە دڵتدا دەریدەکەی؟.

گوتم:چۆنت زانی؟.

گوتی: ئاگام لێته،دڵنیابه وادەزانم له سەر ئەو کورسیەی که هەمیشه له سەری و بەرانبەرت دادەنیشم.دانیشتووم لـه ژوورەکەت،بەڵام توخوا هیچم لێمەشارەوە..

گـوتم: ئـەوین گیـان چیی بڵـێم، ئـازار و خـەمی خوشـکەکانم تـەواو میشکی ئاڵۆزانووم، که دیمەنیان دەبینم به دەسی جەللاد و داوێنپیس و چاوچنۆکانەوە، بـه ڕاسـتی کاریـان تێکـردووم و هـەموو خۆشییەکی ژیانیـان لـه پێشـچاو خـستووم،دۆزینەوەیان، بووەتـه هیـوای یەکـەمی ژیانم.

گوتی: ئەی من بڕیار، منت له بیرچوو؟.

گوتم:دڵنیابه، هیوای دووەمی ژیانم، تەنیا تۆی که ببیته هاوسەرم.

گوتی:حەز ناکەم خەم بخۆی.

گوتم:بـا قسەی نـاخۆش نەهێنینـه نێـو گفتوگـۆی ئـەمڕۆمان، زۆر لـه مێـژه تـەنیا بـه تەماشـاکردنی یەکدی و گۆڕینـەوەی زەردەخەنـەکانمان دڵی خۆمان شادەکەین،ئەمڕۆ،چیی هـەبوو لـه نێـو دڵا دەرمانخست و لـه بۆ یەکدی هەڵمانڕشت.ئێسته پێمبڵێ ئەی دایکت له کوێیه؟

گـوتی: دایکـم چـووه بـازاڕی بکـات، بۆخـۆ ئامـادەکردنی پێـشوازیی ئێوە.

گوتم: ئەوین گیان دایکت ماندوو مەکە. خۆت بچوویتایه.

گوتی: ئەو زۆر باش دەزانێ ئـەو خواردنـەی بۆ ئێوەی دەکات، چۆن بێ و چیی بۆ بکرێ.

گوتم: سوپاس ئەوین گیان،حەز ناکەم دایکت ماندوو بکەی.

گوتی: بۆ ئێوەی خۆشەویست، ماندوو بوون نییه.

گوتم: تۆ بڵێی وابێ؟.

گوتی: گومانت له خۆشەویستییمان هەیە؟.

گـوتم:نـەخێر، دڵنیـام،زۆریش دڵنیـام بـا پـتر (سـەنت)ت لێنـەڕوا، گوڵەکەم.

گوتی: بڕیار گیان، بە خوات دەسپێرم، ئاگاداری خۆتبە.

دامخـست و جگەرەیـەکی دیـم داگیرسان،چـەن مـژێکی تونـدم لێـدا، گـوتم: گـەر تـوانیم خوشـکەکانم لـە ئاگری دۆزەخـی نێـو (تیاترۆخانـە-مـەلهاکان)ی میـسر ڕزگاربکەم،پاشـئەوە یەکـسەر دەچـمە خـوازبێنی ئەوین،لـە دایکـی و (هـەرێم)ی بـرای، (هـەوران) کـە براگەورەیانـە و لـە هەندەرانە،داوایدەکەم،(بێشەرمانە دەڵێم (ئەوین)م خۆشدەوێ، دەمـەوێ ببێ بە هاوسەرم).جا ئەوسا خۆشەویستییم بۆ ئەوین دەسەلمێنم.

ئێواریٚ زۆر بـە زوویـی خـۆم گەیانـدەوە ماڵ و بـە دایکـم گـوت دەبـێ بچین بۆ ماڵی (ئەوین)،چونکە بانگێشتیان کردووین.

دایکـم زۆر ترسـا،وایدەزانی بانگێـشتی مـارەکردنی ئـەوین کـراوین، گوتی:کوڕەکەم چەن لە مێژە دەمویست بۆ خوازبێنی ئەوین بچم، کەچی تـۆ هـەر نەتهێـشت تـا ئـەو کچـە چاکەمان لـە دەسچوو.پێکـەنیم وگـوتم: دایکە گیـان بانگێشت کراوین بـۆ نـانخواردنی ئێـواریٚ (هـەرێم)ی بـرای ئـەوین لـە مـاڵ نییـە، گوتوویانـە ئێـوە بـە کەسـی خۆمـان دەزانـین، حەزدەکەین ئێواریٚ پێکەوەبین.

دایکـم گـوتی: کوڕەکـەم دەوا بڵـیٚ، ترسـام،بە خـودا چـەندیٚ مـن حەزدەکەم تێکەڵ ئەو خێزانە بم،ئەوانیش هێندەی من حەزدەکەن، بەڵام نازانم تۆ بۆ ڕازی نـابی و هـەر ئـەم ئێوارەیـە داخوازییەکەمان بۆ ئـەوین بېڕێنمەوە.

**گوتم: دایکه گیان قوربانت بم، نەکەی باسی ئەو شتانه بکەی، ئەوان بانگێشتی نانخواردنیان کردووین، نابیّ تۆ باسی خوازبێنی بکەیّ.**

**گوتی:بە مەرجیّ،دوای چەن ڕۆژێکی دی،ڕێمپێبدەی بۆ داخوازیی بچم.**

**گوتم: ئینشەڵلا، بەلاّم نەك چەن ڕۆژێکی دیکه، چەن ساڵێکی دی.**

**گوتی:دیسانەوه گوتت،کوڕەکەم، تۆ گەر ژن بێنی، چ ڕێت لێدەگریّ سۆراغی خوشکەکانت بکەی؟.**

**گوتم: دایه گیان من چەن جارێکه دەیڵێمەوه، دڵم نایەت یەکیّ وەك (ئەوین) بکەمه ئازار و خەمەکانی شەوانەمەوه.**

**دایکم ساردبووەوه، نەیدەزانی به چ ڕێییّ وا بکات دڵم ڕازی بکات و (ئەوین)م بۆ بێنیّ.کە دایکمم دەبینی دەچووه نێو دەریای خەیاڵەوه، بەزەییم پیادەهاتەوه،بەلاّم نەمدەتوانی به قسەی بکەم.**

**دەسم کرده ملی و گوتم: ئەوه خەیاڵی چییدەکەی، خۆت ئامادە بکە بۆ ماڵی (بووکی دوا ڕۆژت)،بزەییّ لە سەر لێوانی دایکم دروسبوو، گوتی:خوا کەریمه، ئینشەڵلا به دڵی خۆمان دەبیّ.**

**هەر کە بە ئۆتۆمبیلەکەم ڕوومان لە گەڕەکیان کرد، لەبەر دەرگا لە چاوەڕوانییدا بوو، ئێمەی بینی و بە پەلە چووه ژوورەوه.گەیشتینه پێش دەرگا،خۆی و دایکی هاتنه دەرەوه،دایکم و دایکی باوەشیان لە یەکدیدا،ئینجا ئەوین دەستی دایکی ماچکردم، منیش دەستی دایکی ئەوین.بە فەرموو، فەرموو،کە دەیان جار دووبارەیان دەکردەوه،چووینه ژووری میوان.پاش خێرهاتنیّ گەرم،دایکی ئەوین داوای یارمەتیی لێکردین و گوتی:دەچم بۆ چێشتخانەکه.**

دایکم گوتی:دایکی ئەوین،منیش حەزدەکەم بێم و هێندێ دەمەتەقێ لەگەڵ یەکدی بکەین.هەستمکرد هەردووکیان حەزیاندەکرد جێمانبێڵن. کە جێیانهێشتین، هەردووکمان بێدەنگ،شەرممان لە یەکدی دەکرد،ئەو قسە گەرمانەی لە تێلێفۆن لەگەڵ یەکدی دەمانگۆڕییەوە،لەوێ نەماندەتوانی،زۆر سەیرم دەهات،بۆ وا بەرانبەر یەکدی لاڵ ببووین.چاوم هەڵبڕی تەماشایەکی ژوورەکەم کرد،بەرانبەرم دیمەنێ سەرنج ڕاکێش هەڵواسرابوو،پەپوولەیەکی باڵ نەخشین،لە سەر گوڵێکی سوور هەڵنیشتبوو.گوتم: بە ڕاستی دیمەنێ زۆر جوانە.

گوتی: دەزانی ماناى چییە؟.

گوتم: پاکی و بێگەردییە، وانییە؟.

گوتی: بەڵێ وایە،لە هەمووی گرنگتر بە یەکگەیشتنی پەپوولە و گوڵە، کە خۆشەویستییان تەنیا لە وەرزی بەهار دەگۆڕنەوە و بە یەکدی شادەبنەوە.

گوتم: بەڵێ ڕاستە ، دیارە پەپوولەکە چەن بە تامەزرۆوە شیلەی نێو گوڵەکە دەمژێ، گوڵەکەش بە هێمنی و ئارامیی خۆی گەشتر پیشاندەدا.

ئەوین ڕەنگی ئاڵوگەشی،سووربووەوە،سەری داخست، بە شەرمەوە چاوی هەڵبڕی وخەندە لە لێوانی دەباری،کەمێ بێدەنگبوو،منیش بزەیەکم بۆ کرد و گوتم:بۆ وا بێدەنگبووی، قسەکانم ڕاستنین؟.

گوتی:بەڵێ ڕاستن،پەپوولە و گوڵ هەمیشە عیشقی یەکدین، بەڵام تەمەنی خۆشەویستییان زۆر کورتە.

گوتم: گەر کورتیش بێ، بەڵام ئەوان لە ژیانیان تەنیا خۆشەویستیی دەناسن.

گوتی: بۆ هەیە جگە لە خۆشەویستیی شتی دیکە بناسی؟.

گوتم: بەڵێ زۆر هەیە ئازارو خەمەکانی هێندەن، زۆرجار بە ناچاری خۆشەویستیی فەرامۆش دەکات.

گوتی: چۆن، مەبەستت چییە؟!!.

گوتم: خۆشەویسترین کەسم تۆی،ئەوین گیان تەنیا تۆی،بەڵام ئازار و خـەمی خوشـکەکانم و کەسـانی ئـەنفالکراوم،زۆرجار کاریگـەریان زۆر هەیە بۆ خۆشەویستییم.

چاوەکانی پڕ ئاو ببوون،دەیویست بگری بەڵام لەبەر دایکمان دەری نەدەبڕی.

گـوتی: کەواتـە تـۆ منـت زۆر خـۆش نـاوێ؟!!.گـوتم: زۆر تـۆم خۆشدەوێ،لە چاوەکانم پتر خۆشمدەوێی،هەر ڕۆژێ خەمەکانم کۆتایی هات ،ئەو کەسەی دەبێتە هاوسەرم،تەنیا تۆی، گەرنا، ژن ناهێنم،چونکە ناتوانم کەسی دیکە بکەمە هاوسەر.

لەو کاتە دایکم هاتە ژوورەوە،ئێمە بێدەنگبووین.ڕووم کردە دایکم گوتم: دایکە گیان لەگەڵ دایکی ئەوین باسی چییتان دەکرد؟.

گوتی: دەمەتەقێمان دەکرد،باسی چەندین ساڵ لەمەوبەرمان دەکرد.

ئەویش گوتی:ئەی ئێوە باسی چییتان دەکرد؟.

گـوتم:دایکـە گیـان باسـی ئـەو دیمەنـەمان دەکرد،نـەتبینیووە ئـەو پەپوولەیە چـۆن بـەو گوڵـەوە نیشتووەتەوە.لەو کاتە ئـەوین هەسـتا و زەردەخەنەیەکی زۆر بە نازەوەی بۆ کـردم گوتی: بە یارمـەتیتان دەچم بزانم دایکم پێویستی بە من نییە. ئەو ڕۆیشت.

دایکم گوتی: کوڕەکەم ئەمە دیمەنێکە و دەیبینی، کاتی خۆی لە نێو گوندەکەمان،لەم دیمەنانە بە شێوەی ڕاستەقینە دەمانبینی،ئێوە منداڵ

بوون و دەکەوتنە دوای پەپوولەکان،ئەوانیش لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ هەڵدەفڕین،لە گوڵەکان نەدەبوونەوە.

دایکی ئەوین هاتە ژوورەوە، دیسانەوە خێرهاتنی لێکردینەوە گوتی: فەرموون با بچین بۆ ژووری نانخواردن وا ئەوین خەریکی دانانی خواردنەکەیە.پاش نانخواردن وبردنە سەری کاتێکی خۆش،ماڵئاواییمان لێکردن.کە چووینەوە،تا نیوەشەو دایکم نەنووست، هەر دەیگوت و دەیگوتەوە،(کوڕەکەم نەکەی ئەوین لە دەس خۆتبدەی،بە ڕاستی زۆر جوان و ژیر و ڕۆشنبیرە).

گوتم:دایکە گیان ڕاستە،بەڵام دڵم نایەت جاریَ داوای بکەم،سوێندبیَ بە گیانی پاکی شەهیدان،هەر کە ئەو هیوایەم هاتە دی ،ئەوسا بڵێم دایکە گیان با بچین بۆ خوازبێنی (ئەوین).سەری هەڵبڕی ودەسی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و گوتی:خوایە گیان، ئەوەی لە دڵماندایە بێنیتە دی،چارەنووسی ئەنفالەکان ئاشکرا بیَ و پەردە لە ڕووی ڕەشی دوژمنەکانمان هەڵماڵی و ڕیسوای دونیا وڕۆژی دواییان بکەی.پاشان گوتی: من وا دەچمەوە بۆ ژوورەکەم.

گوتم:دایکە گیان،شەوت شاد،منیش زۆر ماندووم دەمەویَ زوو بنووم. چوومە سەر جێی نووستنم،خەیاڵ نەیدەهێشت بنووم،ئەوین باوەشی کردبوەوە داوای هاوسەرێتی لێدەکردم،تا ببێتە جوانترین و خۆشەویسترین هاوسەر، خوشکەکانم بە دەس ناپاکان و داوێنپیسانەوە هاواریانبوو،دەیانگوت کاکە بڕیار فریامان بکەوە،دیمەنی قێزەونی ئەو داوێنپیسانە لە پێش چاوم وننابوو،بە ناچاری دەرگای (سەلاجە)کەم کردەوە،دوو بیرەم دەرهێنا،چەن پێکێکم هەڵدا وچەن جگەرەیەکم کێشا،(ئەوین) وەك گوڵە سوورەکەی دیمەنی

**ماڵیان دەهاتە پێش چاو، منیش پەپوولە ئاسا شیلەی ڕوومەت و لێوانم دەمژی،لە پڕ زریکاندن و هاواری (ئالا و کوردستان)ی خوشکم بە دەست چاوچنۆکان و داوێنپیسانەوە دەهات و(کاکە بڕیار،کاکە بڕیار)یان مێشکی دەشێوانم، ویژدانی دەهەژانم وفرمێسکی لە چاوان دەبارانم،خۆشەویستیی (ئەوین)یان لە بیر دەبردمەوە،هەر لەبەر ئەوە ئەو شەوە بڕیارمدا بە هیچ شێوەیێ (ئەوین) نەهێنم تا خۆم لەو دیمەنە قێزەونانە ڕزگاردەکەم،چونکە دەزانم (ئەوین)یش تووشی دڵەڕاوکێ و ئازار و خەم دەکەم.**

**(٤)**

**یەك مانگ تێپەڕبوو بە سەر داواكارییمان بۆ چوونە میسر،بە ناچاری چووم بۆلای جەنابی وەزیر،پێشنیازمكرد،(گەر ئێوە هاوكارییم ناكەن بۆ چوونە میسر،ئەوا خۆم ئامادەم خانووەكەم و ئۆتۆمبیلەكەم بفرۆشم و بە پارەكەی بۆ (میسر) بڕۆم)،بۆ یەكلایی كردنەوەی كچە فرۆشراوەكانمان،من زۆر ئازار دەچێژم،ئێوە ئاگاداری من نین،ئەو دیمەنەی من لە نێو خەیاڵەكانمدا ئازارمدەدا،نایبینن،ئەو خەونە ترسناكانەی من دەیبینم، ئێوە نایبینن.**

**جەنابی وەزیر گوتی:كوڕەكەم ئاگاداری ئازارەكانتین، ئێمە لە شوێنێ كاردەكەین تایبەت بە مافی مرۆڤە،لە هەر شوێنێ پێشێلی مافی مرۆڤی لێبێ ئازاریی پێدەچێژین،بەڵام كوڕەكەم، سەبارەت بە چوونە میسر كارێكی ئاسان نییە،لەوانەیە پێویست بكا بە ساڵ بمێنیتەوە و هیچ كاری دیكە نەكەی،لە شوێنە نایابەكانیش خواردن وخەوتنت مسۆگەر بكرێ،ئەمیش بودجەیەكی زۆر باشی دەوێ تا دەگەیتە كچانمان،لە پاش ئەوەی توانیت بیاندۆزیتەوە،پێویستت بەوەیە زۆر بە هێمنی و نهێنی بیانهێنیتەوە،ئەویش بودجەیەكی زۆری پێویستە، نەك بە ئۆتۆمبیل و خانووەكەی تۆ،بە پارەیەكی ئێجگار زۆر ئەم كارە ئەنجامدەدرێ،لەبەر ئەوە من كارم بۆ ئەوە كردووە بودجەیەكی زۆر باش دابینكرێ،پاشان بەرەو میسر بڕۆی.**

گوتم: جەنابی وەزیر،بە ڕای جەنابتان کەی بڕیار دەردەچیَ بۆ ئەنجامدانی کارەکە؟

گوتی: ئێمە لە هەوڵدانین،پتر سووردەبین لە دەرچوونی بڕیارەکە، هەر کە دەرچوو،بە نووسراویَ ئاگادارت دەکەینەوە،دڵنیاش بە کوڕەکەم، بۆ ئەم کارە یەکێکی وەك تۆمان دەویَ.

گوتم: سوپاستان دەکەم،منیش لە چاوەڕوانییدام، ئیدی با کات لە بەڕێزتان نەگرم.زۆر بە ڕێزەوە بەڕێی کردم، لە دوا ووتەیدا گوتی:کوڕەکەم ئینشەڵڵا بە دڵی تۆ دەکەین.

دووبارە سوپاسم کرد و چوومەوە بۆ فەرمانگەکەم.

لە ژوورەکەم دانیشتبووم،ئەوین هاتە ژوورەوە،یەکسەر هەستام گوتم: خۆشترین هەواڵ.

گوتی: چییە، ئەوڕۆ دڵت زۆرخۆشە؟.

گوتم: لای جەنابی وەزیر بووم،دڵنیای کردم بودجەییَ زۆر باش خەرجدەکریَ بۆ گەڕان بە دوای کچانی ئەنفال،چونکە دەیگوت لەوانەیە سالَ بخایەنیَ تا کچانمان دەدۆزینەوە.

ئەوین ڕووی گەشی تێکچوو،گوتی: تۆ چیی دەڵێی؟!!.

گوتم: ئەوین گیان دەزانی گەر کۆتایی بەم کێشە و ئازارانەم بێنم، تۆش دەبی بە خۆشەویسترین هاوسەرم.

بێدەنگبوو،بە نائومێدییەوە سەیرێکی کردم،گوتی:دەزانی بۆچیی هاتووم؟!!.

گوتم: نەخێر ئەوین گیان، هەستام و چوومە پێشەوە و دەسم خستە نێو دەسی ناسکی ،بە جووتە لە سەر قەنەفەکە دانیشتین،گوتم: ئێستە هەرچیی هەیە بیڵیَ،با منیش بیکەمە سەرچاوانم.

**گوتی: هەرچییم گوت بە قسەم دەکەی؟.**

**گوتم: بەڵێ، ئەی چۆن، ئەی خۆشەویسترین کەسم نیت.**

**گوتی: گەر فریا نەکەوی،لە دەس یەکدی دەچین.**

**سەرمسوڕما و لاڵ بووم،بە توندیی دەسەکانیم لە نێو دەسم گوشی، نەمدەزانی چ ناخۆشییێ لە پڕ هات و ئەو کەمە خۆشیەی ئەم بەیانیەی هاتە نێو دڵمەوە،ڕایماڵیی.**

**گوتم:دەتەوێ بڵێی چیی؟!!.**

**گوتی: (کاکەم هەوران)،هاوڕێیەکی لە سوید لەگەڵدایە و پێکەوە کاردەکەن،لەبەر خۆشەویستیی نێوانیان،بەو کوڕەی گوتووە کە من ببینێ،گەر پێم ڕازیی بوو شووی پێبکەم ،پاشان (دایکم و هەرێم)ی برامیش لەگەڵ خۆماندا ببەین بۆ هەندەران و لێرە نەمێنین.**

**گوتم:ئەوین گیان نازانم ئەم قسانەت بە ڕاستە یا گاڵتە دەکەی، توخوا ئەوین گیان ئەم قسانەت بە هۆی (٤/١_ یەکی نیسان)وەیە،کە ئەوڕۆیە و ڕۆژی درۆیە.**

**گوتی: نەمزانیووە ئەوڕۆ یەکی نیسانە ،خۆزگە درۆیێ دەبوو و دەمکرد وکۆتایی پێدەهات،بەڵام (بڕیار) گیان ڕاستییە و یەخەی گرتووم و هەموویان ڕازیین،گەرچی دایکم لە سەرەتاوە ڕازیی نەبوو، بەڵام ئەویشیان لێوەرگەڕانەوە و دەڵێ،کچەکەم دەچینە لای (کاکەت هەوران) و ئێرە جێدێڵین.ئەو کوڕەش لەو ڕۆژەوەی بینیومی، سوورە لە سەر ئەوەی زوو مارەم بکات،لە ماوەی دوو هەفتەی دیکە بەرەو هەندەران بڕۆین،لە پاش شەش مانگی دی،(هەرێم) و (دایکم) بە هەوڵی کاکەم وزاواکەیان بگەیەنرێنە هەندەران. دەگریا وئەشکی دەباران،پاشان گوتی: بڕیار گیان،توخوا چارم چییە؟!!، گەر بە زووترین**

کات فریام نەکەوی و داخوازییم نەکەی، ئەوا لە دەستت دەچم،تۆش لە دەسم دەچی.گریا و فرمێسکی گەشی دەباران لەگەڵ گریان هەنسکی دەدا و دەیگوت من نامەوێ بۆ هەندەران بچم، گەر لە هەر شوێنێ بی، دەمەوێ لەگەڵتا بم.

نەمدەزانی چی بڵێم،کێشەیێ گەورەبوو،نەمدەزانی چ وەڵامێ بدەمەوە، حەپەسابووم، تەنیا تەماشای چاوەکانیم دەکرد،لە پڕدا گوتم: ئەوین گیان چارمان چییە؟!!.

گوتی:من بۆلای تۆ هاتووم تا تۆ ئەم کێشەیە چارەسەربکەی.

زۆرم لەخۆم کرد، دەمویست بڵێم ئارەزووی خۆتە،بەڵام نەمدەتوانی، کە سەیری چاوەکانیم دەکرد،هیچم بۆ نەدەگوترا،دەسی برد بۆ پاکەتی کلینسی سەر مێزەکە،کلێنسێکی دەرهێنا،چاوەکانی پێدەسڕی و دەسە ناسکەکەی دەلەرزی،ئێجگاری عیشق و سۆز و خۆشەویستی لە نێو دڵم کڵپەی دەسەند،نەمدەزانی چ ووشەیی دەربڕم، ئەویش لە چاوەڕوانیی وەڵامی من بوو،هەر بۆیە گوتم:ئەوین گیان من وا دەکەم ( هەرێم و دایکت) ڕازیی بکەم،مارەت بکەم و بۆ ساڵێکی دی بتگوازمەوە، نەك هەروا بە ئاسانی لە دەسم بچی.

گوتی: بڕیار گیان، دەترسم زۆر دەترسم.

گوتم: ئەوین گیان، خەمت نەبێ، هەوڵدەدەم ڕازییانکەم.

بە چاوێکی پڕ لە فرمێسك و نائومێدیی،هەستایە سەرپێ، بە سۆزەوە سەرنجیدام و گوتی:من دەڕۆم، دەترسم یەکدی نەبینینەوە.

بە ڕاستی حەزیدەکرد ببێ بە هاوسەرم ،هەندەران و سەروەت و سامانی،بە خۆشەویستییمان نەدەگۆڕییەوە ،خۆشەویستییمان وەك خۆشەویستیی پەپوولە و گوڵ وابوو.

هێـدی هێـدی بـەرەو دەرگـای ژوورەکـە دەڕۆیـشت،چاوەکانی دەسـڕییەوە تـا کـەس نـەزانێ گریاوە،بـەڵام هێنـد فرمێـسکی ڕشتبوو،چاوەکانی ئاوسابوون،دەرگای کردەوە،دوا ئاوڕی دایەوە.لە شوێنی خۆم دانیشتم و جگەرەیەکم داگیرسان،بە چەن مژێ تەواوم کرد و سـەرم خـستە سـەر مێزەکە،نەمـدەزانی شـەوە یـا ڕۆژ،سـەرم لێشێوابوو،لە پڕ تریفەخان هاتـە ژوورەوە،گـوتی: کـاک بڕیـار بـۆ وا دەکەی، سەرت ئازاری هەیە؟.

سـەرم هەڵبڕی،هەناسـەیەکی زۆرقـوڵم هەڵکێـشا،گوتم:خوشـکە بەڕێزەکەم، دانیشە بزانە چ ئازار و کێشەیەکم بۆ دروسبووە.

گـوتی:دەزانم،(ئەوین)یـش هـەروا دەگری،منیـشی خـستە گریان،کاك بڕیار، هەرچییتان دەوێ پێمبڵێ، ئامادەم هاوکارییتان بکەم.

گـوتم: تریفەخان،بە ڕاستی خوشکی ڕاستەقینەی منی،من نامـەوێ دایکم بچێ بۆ خوازبێنی،دەمـەوێ تۆ بچی قسە لەگـەڵ دایکی ئەوین بکەی،بڵێی ئەوین ببێتە دەسگیرانم تا یەك ساڵ،پاشان دەیگوازمەوە، گەر وا بکرێ،من و (ئەوین) بە ئاسانی بۆ یەکدەبین.

تریفەخان گوتی:هەر ئەم ئێوارەیە دەچم و بە دایکی ئەوین دەڵێم ، هەردوو دەسەکانیشی ماچ دەکەم، تەنیا بۆ ئەوەی ڕازیی بێ.

هۆشێکم هاتەوە، کەمێ گەشبوونەوەم بە خۆوە بینی و گوتم:گەر وا بکرێ و ڕازیی بن،من و ئەوین قەرزارت دەبین،ئەی بۆخوشکەکەم هەر ئێستە ناچی،چونکە تا زوو بچی درەنگە.

گوتی: هێشتا دوو کاژێر کاتی دەوام ماوە .

گوتم:گرنگ نییە،لە ئێستەوە تۆ مۆڵەتی،تەنیا ئەم کارەمان بۆ بکە، زۆر سوپاست دەکەین و هیچ کات وەفاداریت لە بیر ناکەین.

بە پەلە هەستا و گوتی: با بچم ئەم هەواڵە خۆشە بگەیەنمە ئەوین، بەڵکو کەمێ لە خەم و گریانی کەمدەبێتەوە.

ئێوارێ لەماڵەوە لە چاوەڕوانیی تێلێفۆنی تریفەخان بووم،هێند شێواو و شپرزە دیاربووم،دایکم هەستیکرد،گوتی:چییە کوڕم بۆ وا شێواوی، خۆ هیچ نەبووە؟!!.

گوتم: نەخێر دایکە گیان، بەڵام هەر خۆم دڵتەنگم.

هاتە تەنیشتمەوەو دانیشت ،دەمی دەجوڵان،زانیم ئایەت دەخوێنێ، لە پاش تەواوبوونی لە ئایەت خوێندن، دەسی بە سەروچاو و شانم هێنا و ناوی خوای دەهێنا.زۆر بەزەییم پێهاتەوە،چونکە من هەموو هیوای بووم لە ژیانییدا، تەنیا من بە خۆشەویسترین کەسی خۆی دەزانێ، پێویستە منیش دڵی ئازارنەدەم،هیچ کات خۆم بە دڵتەنگی و شێواوی پیشان نەدەم تا ئازار نەچێژێ.بە پەلە دەسەکانیم ماچکرد و گوتم: دایکە گاڵتەم کرد،حەزمکرد بزانم چییدەکەی گەر بڵێم دڵتەنگم.

گوتی: کوڕم زۆر ترسام، وامزانی شتێ بووە، ئێستەش دڵم هەر دەترسێ و دەڵێ شتێ بووە،دڵی دایکیش درۆ ناکات.

گوتم:دایکە گیان بڕوا بکە هیچ نەبووە، بە پێچەوانەوە من دڵم زۆر خۆشە،چونکە ئەوڕۆ لای جەنابی وەزیر بووم و دەیگوت دەتنێرین بۆ سۆراغی خوشکەکانت.

دایکم لە خۆشی ئەو هەواڵە نەیدەزانی چیی بڵێ وچیی بکات، یەکسەر سەری ماچکردم،گوتی:گەر خوشکەکانت بدۆزیایەوە.هیچم لە ژیان نەدەویست،لە سەر بەرماڵەکەم لانەدەچووم،هەمیشە هەر سوپاسی خوام دەکرد.

گوتم:ئێستە دڵنیابووی دڵتەنگییەکەم بە گاڵتەوە بوو؟.

**گوتی: نازانم، بەڵام هەواڵی زۆر خۆشت پێگەیانم.**

**گوتم: یاخوا هەر لە خۆشییدابی.**

**گوتی:وا نزیکی بانگی ئێوارێیە و بچم دەستنوێژ هەڵگرم،نوێژەکەم بکەم و خواردنی ئێوارێش ئامادە بکەم.**

**گوتم: زۆر چاکە دایکە گیان، منیش تا سەربان دەچم.**

**لە سەربان بووم،تەماشای شاخەکانی چواردەوری شارم دەکرد، لەو کاتە زەنگی مۆبایلەکەم لێدرا، تریفەخان بوو،بە پەلە کردمەوە و گوتم: فەرموو تریفەخان، لە مێژە چاوەڕوانم.**

**گوتی: حەزم نەدەکرد وەڵامی دایکی (ئەوین)ت پێبڵێم.**

**گوتم: دیارە ڕازیی نەبووە؟.**

**گوتی: نەك ڕازیی نەبوو، سبەینێ ئەوین مارە دەکرێ.**

**گوتم: چۆن؟!! بە ڕاستە، ئەی ئەوین هیچی بە دایکی نەگوت.**

**گوتی:چیی بڵێ،دایکی و براکەی لە خۆشی هەندەران پەلە لە زاواکەیان دەکەن بە زوویی ئەوین ببات ،تا مامەڵەی دەرچوونی ئەوانیش بۆ سوید تەواو بکات.**

**گوتم: کە بە دایکیت گوت وەڵامی چیی بوو؟**

**گوتی:دایکی ئەڵێت قسەی کوڕەکانم بۆ ناشکێ،(هەوران)ی کوڕم لە (سوید)ە وە ئەم زاوایەی ناردووەتەوە،ئێمە ناتوانین هیچ بڵێین. چەندێ گوتم کاك بڕیار مارەی دەکا ولە ماوەیەکی زۆر کورتدا دەیگوازێتەوە،بەڵام بێسوودبوو،خۆشی هەندەران لە مێشکی پیرێژنەکەی دایکی (ئەوین)یشی دابوو.**

**گوتم: ئەی من و ئەوین چارمان چییە؟.**

گوتی:دوا گوتەی ئەوین بۆ تۆ، بە گریان و بە چەن ووشەیەکی پڕ لە نائومێدییەوە گوتی:پێیبڵێ( کۆتایی نێوانمان هات،ڕەشەبایەکی بە هێز و بە تەوژم منیشی ئەنفالکرد،زۆر بە ناچاری بەرەو هەندەران دەڕۆم دڵنیاشبە زۆر هەوڵمدا لەگەڵ دایك و براکانم کە من لە کوردستان جێبێڵن،بە ڕاشکاوانەش پێمگوتن من (بڕیار)م خۆشدەوێ، دەمەوێ شووی پێبکەم،بەڵام گاڵتەیان پێدەکردم و گوتیان:کەی لەم ڕۆژەدا خۆشەویستیی ماوە،بە ڕاستی دایك وبرا بۆ خۆشیی خۆیان بە هەندەرانیان فرۆشتم،سەرەڕای ئەوەی خۆم فەرمانبەرم لە مافی مرۆڤ، کەچی زۆر بێتوانام ،ناچاریان کردووم لەگەڵیان بچم ،هەرگیز تۆش لە بیر ناکەم،بەڵام لە ئەوڕۆوە نامبینیتەوە چونکە دە – دوازدە ڕۆژی دی کوردستان جێدێڵم).

گوتم:بە ڕاستە تریفەخان،پتر قسەم بۆ نەکرا،خەریکبوو ببورێمەوە، ئێستێك بێدەنگبووم،تریفەخان گوتی: بڕیار،بۆ وا بێدەنگبووی؟!!چەن جارێکی دی هاواریکرد،کەمێ هۆشم هاتەوە و گوتم:هیچ نییە، هەواڵەکە زۆر ناخۆش و کتوپڕبوو،داوای لێبوردندەکەم،دڵی تۆشم ئازاردا، تۆ خوات لەگەڵ. دامانخست.

تەواو بێهۆش بووم ونەمدەوێرا لەبەر دایکم بچمە خوارەوە،دەترسام بزانێ زۆر پەشێو و شێواوم.سەر ئەو شاخانە سەدا و دەنگی هاواری کچان بوو،(ئەوین دەیگوت:ئەنفالکرام و فرۆشرام،خوشکەکانم هاواریاندەکرد،کاکە بڕیار فریامان بکەوە لە دەستی چەپەڵی جەللاد و داوێنپیسان).مێشکم هێندەی نەمابوو بتەقێ،بە هەر دوو دەستم توند سەرمگرت،پتر توندمدەکرد،دیسان زەنگی مۆبایلەکە لێدرا، ئەوین نووسرابوو،نەمدەزانی چۆن بتوانم قسەی لەگەڵ بکەم،خۆم بە تاوانبار

دەزانی،خۆزگە ئەو ڕۆژەی دایکم گوتی با داخوازیی بکەم،بە قسەم دەکرد،ئەوسا یەك ساڵ چاوەڕوانییمان دەکرد،پاشان ئاهەنگی گواستنەوەمان سازدەکرد،بەڵام ئاخ، کە "داری خۆزگە بەر ناگریٚ" زۆر زەنگی لیٚدا، نەمتوانی دڵی بشکیٚنم بە ناچاری کردمەوە، ئەوین گوتی: بۆ وەڵام نادەیتەوە.

گوتم: چ وەڵامیٚ،میٚشکم تەقی ئەوین گیان،چیی بکەم، نازانم چۆن لە پاش تۆ بژییم؟!!.دەگریا، بە گریانەوە دەیگوت:(بڕیار)،تازە کار لە کار ترازا، بۆ یەکدی نابین،ئەنفالکرام و فرۆشرام، (بڕیار)، ئاگاداری خۆت بە ، توخوا گەر ڕۆیشتم پیٚوەندییم پیٚوە بکە، دڵنیابە هەر تۆم خۆشدەویٚ.

گوتم:پاش چیی پیٚوەندیی بکەم، دایك و براکانت خۆشەویستییان سوتاندین.گریان قوڕگی گرتبووم، دەنگی تەواو گۆڕیبووم،گوتم: ئەوین گیان بە ڕاستی دەگریم بۆ خۆم وخۆت،نازانم خۆشەویستیی ئیٚمە بۆ وای لیٚهات، لیٚکدابڕان کاریٚکی زۆر گرانە،ناتوانم بەرەنگاریکەم.

ئەوین دەگریا و وەڵامی بۆ نەدەدرایەوە،پیٚمگوت: ئەوین گیان وەڵام بدەرەوە،ئەمە چ کابوسیٚ بوو تووشمانبوو،خۆشەویستییمان زۆر پاکوبیٚگەردبوو،وەك دیمەنی پەپوولە و گوڵەکەیماڵتان وابوو، بۆ وامان بە سەرهات،بۆچیی؟!!.

تەنیا دەنگی گریەی ئەوینم گویٚ لیٚدەبوو،هیچمان ووشەی دیمان پیٚنەمابوو،تەنیا دڵمان قسەیدەکرد. پاش کەمیٚ،گریانمان کەمبووەوە، گوتم: ئەوین گیان با دایکت نەزانیٚ.

گوتی:من لە سەربانم،نەمدەویٚرا لە خوارەوە قسەت لەگەڵ بکەم، چونکە زاوای دایکم و براکەم لە ماڵە.

گوتم: منیش لە سەربانم وحەزم نەدەکرد دایکم بەم هەواڵە بزانیّ، چونکە دڵنیام زۆر تیّکدەچیّ،حەز ناکەم بزانیّ دەرۆی و جیّماندیڵی.

گوتی: منیش چاوم بەرایی نادا بیّم و دوا مالأوایی لیّبکەم،چونکە هەموو هیوای ئەویش من بووم کە ببم بە (بووکی).

گوتم:با ئاشکرا نەبی ئەوین گیان،برۆ خوارەوە بۆلای ئەو جەللادانە، ئەو پارەپەرستانە.

دوا مالأوایی لیّکردم گوتی:دە – دوازدە رۆژی دیکە ئیّجگاری شار بە جیّدیڵم.

گوتم:شار بیّ تۆ چۆڵە ،فەرمانگە بیّ تۆ دەبیّ بە دۆزەخ،ئاخ ئەوین گیان،قوربانی چاوەکانت بم،قوربانی ووشەی پاراو و ناسکت بم، چۆن جیّمدیڵی، چۆن؟!!.

کڵپەی گریانی بوو،لە پڕ گوتی:دایکم وا بەرەو سەربان دیّ، بڕیار گیان من قوربانت بم، مالأوا.

ئازاریّکی بیّکۆتای لە نیّو دلّ داگیرسان،بە خوڕ ئەشکی لە چاوان دەبارانم،لەو کاتە دایکم بانگیکردم و گوتی: کوڕەکەم، درەنگە وەرە خوارەوە با خواردنەکە سارد نەبیّتەوە.

لەبەر دلّی دایکم بە پەلە چوومە خوارەوە و چاوەکانم شۆری،چەن پارویەکم خوارد،یارمەتیم لە دایکم وەرگرت و چوومەوە ژوورەکەم، کە سەلاجەکەم کردەوە ،هیچ خواردنەوەی تیا نەمابوو، بە ناچاری بە ئۆتۆمبیلەکەم چووم بەرەو کرینی (ویسکی و بیرە) و جگەرە، دەمزانی شەو نوستنم نابیّ و ئازارەکانم دەبیّ بە دوو ئازار.

ئەو شەوە لە هەڵدانی هەر پیّکیّ،ئەوین و خوشکەکانم هاواریان دەکرد، دەپاڕانەوە کە فریایانکەوم. تا نزیک بەرەبەیان،لەگەڵ ئەو هەموو

خواردنەوانە،هێشتا بێسوودبوو،چونکە ئازارەکانم ئێجگار قووڵبوون،بیر ناچوونەوە.

بەیانی درەنگ لە خەو هەستام و پێوەندییم بە فەرمانگەوە کرد گوتم: ئەورۆ زۆر نەخۆشم، بۆمی بکەنە مۆڵەت.

ئێواریَ،فەرمانبـــەرەکان بـــۆ مـــاڵ هاتن،زۆربـــەیان دەیـــانزانی نەخۆشـییەکەم لەبەرچـییە،دایکم کـە تریفـەی بینی،یەکسەر پرسـیاری ئەوینی لێکرد، تریفە حەزی نەدەکرد ڕاستییەکە بە دایکم بڵێ،هەر بۆیـە گوتی: ئەویش کەمیَ ناساغە، بۆیە نەهات.

کە هـەموویان ڕۆیـشتن، هەسـتمکرد ئەوین زۆر شـوێنی دیـارەبیَ لـە ژیانم،بیَ ئەو ناژیم. بێهیوا مامەوە لە ژیان،تەنیا هیوام ئەوە بوو بگەمە خوشـکەکانم و لــە نێــو دۆزەخ ڕزگاریانکــەم و بیانهێنمــەوە باوەشــی نیشتمان وخێزان،ئەوسا پێکەوە لەگەڵ دایکم، ئەو چەن ساڵ تەمەنەی کە ماومە،بیبەمە سەر و کەس نەکەم بە هاوسـەرم،بەڵام تـا پیریش دەبم، دەبـیَ پێوەنـدییم لەگـەڵ ئـەوین نـەبڕم، گـەر نەشـیبینم، تـەنیا دەنگـی ناسکی دەکەم بە سەمفۆنیای ژیان و لایلایەی شەوانەم.

(٥)

نەمتوانی بەشداربم لە شەکراو خواردنەوەی ئەوین،بەلام ئەو بە تریفەخان پاکەتێ شیرینی بۆ ناردم ،منیش خستمە نێو چەکمەجەی مێزەکەمەوە،ڕۆژانە تەماشای شیرینێکەم دەکرد،دەس و پەنجەی (ئەوین)م تێیا دەبینی،دەمزانی بە چاوێکی پڕ لە فرمێسک،بە دەستی لەرزۆکەوە پاکەتی شیرینیەکەی بۆ پێچاومەتەوە و بۆی ناردووم،زۆر ئازاریدەدام،خۆم و فەرمانگەکەم بێتوانا دەهاتە پێشچاو،کە ئێستە پێشێلی مافیی پاکوبێگەردترین کچ دەکرێ و هەموو لێی بێدەنگین.

بەیانی زوو بوو،زۆر زووبوو،ئەوین پێوەندیی پێوە کردم و بەیانی باشی لێکردم وگوتی: دەزانی ئەمڕۆ (٤/١٤)ە، ساڵیادی کارەساتی ئەنفالە،منیش هەر ئەمڕۆ کاژێر ٨ی بەیانی بەرەو هەندەران دەڕۆم ؛ وا دەزانم دەمنێرن بۆ دۆزەخ،نازانم بڕیار گیان تۆچیی دەڵێی ، گەر نەڕۆم ، پێکەوە بەرەو سنوورەکان بڕۆین و شار جێبێڵین،لە پاشان بچینە دادگا، سکالا لە دژ دایك و براکانم بنووسم.

گوتم: ئەوین گیان،تازە کار لە کار ترازا،ئەو چارەسەرەی تۆ دەیڵێی زۆر گرانە،بە هۆی منەوە با لە دایك و برات نەبی،. کێ دەڵێ منیش بڕیاری چوونم بۆ میسر دەربچێ،دەگەڕێمەوە.کێ دەڵێ کاربەدەستانی میسر نامگرن و نهێنییەکان ئاشکرا نابێ و لە سێدارە نادرێم. ئەوین گیان تۆ بڕۆ و بە خوات دەسپێرم، هیوادارم ژیانێکی پڕ لە خۆشیی و

ئاسوودە لەگەڵ ئەو کوڕە ببەیتە سەر.گریا و گوتی: گەر ڕازیی بی، هەر ئێستە دەگەمە لات، توخوا ڕازیی بە، چونکە من بیٚ تۆ ناتوانم بژیم.

گوتم: ئەو هەڵەیە مەکە، دڵنیام ئەو هەڵەکردنە لە کۆمەڵگەی ئێمە زۆر ترسناکە،با ئابڕووت لە نێو خەڵکی پارێزراو بیٚ و باست نەکریٚ، زۆرم خۆشدەویٚی ،بەلاٚم برۆ ئەوین گیان،ئەوڕۆ خۆشترین ڕۆژت بیٚ.

گوتی: بیٚ تۆ ناخۆشترین ڕۆژە،وا دەزانم (کچێکی) ئەنفالکراوم، قولە ڕەشیٚ بە زۆر دەسی گرتووم.

گوتم: ئەوڕۆ ساڵیادی کارەساتی ئەنفالی بەدناوە، هەموو ساڵیٚ لەم ڕۆژەدا پتر بە دەسی یادکردنەوەی ئەنفالکراوان ئازاردەچیٚژم،وا ئێستەش لەم ڕۆژەدا خۆشەویستێکی پاکوبێگەردم لە دەس دەچیٚ.

گوتی:تەنیا هیوا و چارەسەرم پێگوتی، بەلاٚم ناڕازییت، بڕیار گیان ئیدی من نابینیتەوە،پاش دوو کاژێری دیکە لە فڕۆکەخانەوە بەرەو سوید دەچین،ئاسمانی کوردستان جێدێڵم.دوا مالاٚوایمان لە یەکدی کرد.

تەزوویەکیٚ مێشکی کاسکردم،گوێم لە لێدانی دڵم بوو،چۆکم دەلەرزی، پتر نەمتوانی مۆبایلەکە بە دەسەوە بگرم،کەوتمە سەر دۆشەکەکەم، چاوەکانم قورسبوون،زمان لاڵ ببوو،نەمدەتوانی هاواربکەم بۆ دایکم، لە لێدانی دەرگای ژوورەکەم و هاواری دایکم بە ئاگا هاتم،دەمویست هەستم و دەرگا بکەمەوە،بەلاٚم هێزم نەبوو، کەمیٚ پەنجەکانی دەسم جولاٚند،هێندیٚ وەرزشم بە پێمکرد،دەنگی لێدانی دەرگاکە، دەنگی بە سۆزیی دایکم،بە هۆشی هێنامەوە،لەبەر دایکم، هێزێکی زۆرم بە خۆمدا، هێدی هێدی چووم بۆ کردنەوەی دەرگاکە، کە کردمەوە دایکم گوتی:کوڕەکەم بۆ وا ڕەنگت تێکچووە،چیی بووە قوربانت بم،تۆ بۆ

دەرگات کلیل داوە،من هیچم بۆ نەدەگوترا تەنیا سەیری دایکم دەکرد، باوەشی لێدام و دای لە کوڵپەی گریان گوتی:دەزانم ئەمشەو تەماشای تێلێڤزیۆنت کردووە،فیلمی ئەنفالەکانت بینیووە،کوڕەکەم خەم مەخۆ، تۆ زۆر ئازار دەچێژی،خۆ هەر ئێمە کەسمان ئەنفالنەکراوە،گوندەکانی کوردستان هەموو ئەنفالکراون،گەر من و تۆش سەردانی ئەم شارەمان نەکردایە، ئێستە لەگەڵیاندا بووین.

زمانم کرایەوە،حەزم نەدەکرد پتر دایکم ئازاربدەم،گوتم: خۆزگە دایکە منیش ئەنفال دەبووم و ئەم ڕۆژەم نەدەدی.

دایکم گوتی:چیبکەین کوڕەکەم،لێپرسراوان هەموو ساڵێ برینەکانمان دەکولێننەوە و هیچمان بۆ ناکەن و تا ئێستە چارەنووسی ئەنفالکراوان نادیارە. نەمدەتوانی بە پێوە بم، هێدی هێدی گەڕامەوە بۆ سەر دۆشەکەکەم، دایکم قۆڵی گرتبووم،هەر دەیگوت:خوا گیان فریام بکەوە هەر ئەم کوڕەم ماوە،بەرخێ دەکەمە خێر،تەنیا کوڕەکەم لە دەرد و بەلاّ بە دووربێ و هیچی لێنەیێ.کە بە تەواوی بە هۆشی خۆم هاتمەوە، تەماشای کاژێرم کرد، دوو کاژێر تێپەڕ ببوو بە سەر کاتی پێوەندیی من و ئەوین،هەر بۆیە گوتم:دایکە گیان تا تۆخواردن ئامادە دەکەی، دەچمە سەربان هەوایەکی پاك هەڵدەمژم.

گوتی: بە تەنیا مەڕۆ، منیش دێم.

گوتم: دەمەوێ تەنیا خۆم بچم.

گوتی: باشە کوڕەکەم، بەڵام ئاگاداری خۆت بە.

گوتم: خەمت نەبێ، ئێستە زۆر باشم. بە پەلە دەڕۆیشتم،حەزم دەکرد زوو بگەمە سەربان و ئەو فڕۆکەیە ببینم کە (ئەوین) دەگەیەنێتە (سوید) و کوردستان جێدێڵێ،ئەوین ووتەنی "ئەنفالدەکری". تەماشای لای

فرۆکەخانەکەم دەکرد، لە پڕ فڕۆکەیێ هەستا بەرەو ئاسمان،دڵنیا بووم کە ئەوین لە نێویدایە، چونکە لە کاژێری هەشت ،چەن خولەکێ تێپەڕ ببوو.بیر و هۆشم لای ئەوین بوو کە ئاخۆ دەبێ ئێستە لە تەنیشت (زاوا) دانیشتبێ و چیی لەگەڵ یەکدی باسبکەن،تۆ بڵێی من لە یاد بکات وئەو کوڕەی خۆشبوێ، بڕوا ناکەم خۆشەویستییەکەی کاڵ بێتەوە و من لە بیر بکات،سەیری فڕۆکەکەم دەکرد،ئاوی لە نێو چاوەکانم دەردەهێنا، (ئەوین)م لە جامەکانەوە دەهاتە پێشچاو، سەرنجی ماڵی ئێمەی دەدا،وامدەزانی دەسی دەرهێناوە و (بای بایم) بۆ دەکات و فرمێسك دەبارێنێ، هەر بۆیە لە پڕ دەسم بەرزکردەوە، ڕامدەوەشاندو بای بایم دەکرد و دەمگوت:ماڵاوا ئەوین گیان،بە خوات دەسپێرم ،هەر تەماشام دەکرد تا تەواو لەبەر چاو وونبوو، فڕۆکە دیار نەما. گوێم لە دەنگی پێی دایکم بوو بە پلیکانەکانەوە بەرەو سەربان دەهات،سەرم داخست و بەرەو خوارەوە دەچووم،دایکم لە نێوەندیی پلیکانەکان بوو، گوتی:کوڕم ئێستە چۆنی، هەوای پاکت هەڵمژی.

گوتم: دایکە گیان، زۆر باشم.

گوتی:دە ئێستا با بچین نانبخۆ،پاشان بۆلای دکتۆر بچین.

گوتم: دایکە گیان چاکبووم،بەڵام پێویستم بە پشوودان هەیە.

چەن پاروویێ نانمخوارد ،چوومەوە ژوورەکەم، دەرگام کلیلدا، لە سەر دەم لێڕاکشام،دڵم هەر لای ئەوین بوو، شاری لێچۆڵکردم. بڕیارمدا منیش شار چۆڵکەم، بە بۆنەیساڵیادی ئەنفالەوە سەردانی جەنابی وەزیر بکەم و داوای چوونە میسری لێبکەم.

هەر بۆ بەیانی کە (٤/١٥) بوو،گەیشتمە ژووری وەزیر،منی بینی هەستا، گوتی: لە کاتی خۆیدا هاتی،هەموو شتێ تەواوبووە، یەك

هەفتەی دی،دەبێ بۆ میسر بڕۆی، لەم هەفتەیە یەکێ لە شوێنی خۆت دادەنێی،خۆتیش (مۆڵەتی کراوە)ت بۆ واژۆ کراوە،جگە لەوەش پازدە هەزار دۆلار تەرخانکراوە،وەریگری وکارەکانی میسری پێئەنجامدەی. ئەنجامدانی ئەم کارەش زۆر بە نهێنیی دەبێ ،نابێ لە نێوان من و تۆ و لیژنەکە دەرچێ، تا دەگەیتە ئەنجام.تێگەیشتی کوڕم؟.

گوتم: جەنابی وەزیر زۆر باش تێگەیشتم، سوپاس بۆ ئەو هاوکارییە بێوێنەیەت.

بە ڕاستی خۆشیێ بوو، کەمێ لە ئازاری ناخۆشییەکانی دوێنێی لە یەخەم کردەوە،هەر بە پەلە لە ژووری وەزیر دەرچووم و بەرەو فەرمانگەکەمان ڕۆیشتمەوە،بەڕێوەبەری گشتییم تێگەیاند،(هیوا)یان لە شوێنم دانا،بە تریفەخانمیش گوت،چاودێریی دایکم بکات،چونکە چوونی من بۆ میسر نهێنییە، نابێ پێوەندیی بە هیچ کەسەوە بکەم تا دەگەمەوە کوردستان.لە نووسینگەیێ، فیزا و پسوڵەی ڕۆیشتن بۆ قاهیرەم وەرگرت.ڕۆژێ پێش چوونم بۆ پایتەخت،ماڵاوابوونم لە هەموو هاوڕێکان کردبوو، تریفە و براکەی بۆ ماڵ هاتن، دایکم هەر دەگریا و نزای بۆ دەکردم کە خوا پارێزگارییم بکات، بە (تریفە)ی گوت: کچەکەم تۆ جوانکەی، نزای خێری بۆ بکە، نازانم ئەوین لە کوێیە، دەنگی نییە، لە مێژە نەمبینیوە، زۆر حەزدەکەم لە پاش چوونی (بڕیار) بۆ دەرەوە، هاتووچۆم بکات،چونکە هەموو هیوای من (ئەوین)ە، تا ببێ بە (بووکم).

(تریفە) گوتی: دایکە گیان من کچی تۆم و خوشکی کاک (بڕیار)م، هەرچییت ویست من ئامادەم جێبەجێیبکەم.

دایکم گوتی: یاخوا ڕوو سپی بی کچم، هێندەی (ئاڵا و کوردستان) خۆشەویستیی.

گوتم: دایکە گیان، هەر چییت ویست بە تریفەخان بڵێ.

ماچی کردم گوتی: خوا تۆ بپارێزێ لە وولاتی غەریبی، خوا کەریمە و تریفە خانیش کچی منە.

شەوێ تا درەنگ هەر لە ژوورەکەی دایکم بووم، بەرە بەیان لە دەنگی ئایەت خوێندن و نوێژکردنی دایکم بە ئاگا هاتم ، نانی دەسی دایکم خوارد، بەو بەیانی زووە لە دەرگا درا، کە کردمەوە (تریفە و براکەی) بوون، هاتنە ژوورەوە، ئەوانیش بەو ماڵاوا بوونە زۆر دەگریان و بەزەییان بە دایکمدا دەهات. سەیری کاژێرم کرد، گوتم: بۆ من درەنگە، دەسی دایکم ماچکرد گوتم: دایکە گەردنم ئازا بکە. باوەشی لێدام، بۆنی پێوەدەکردم، دەسی لێم نەدەبووەوە، هەر لە ئامێزی یەکدیا بووین.

گوتم: دایکە گیان، ئینشەڵڵا (ئاڵا و کوردستان) لەگەڵ خۆم دێنمەوە، دایکە مەگری ، دەبێ دڵت خۆشبێ کە بۆ لای خوشکەکانم دەڕۆم.

(تریفە و براکەی) گوتیان: ئێمە دەچین کاک (بڕیار) بەڕێ دەکەین لە پاشان دێینەوە بۆ لات و هیچ کات جێت ناهێڵین.

دەسی دایکم ماچکردەوە و جانتاکەم هەڵگرت، سواری ئۆتۆمبیلی (براکەی تریفەخان) بووم، هەرسێکمان ڕۆیشتین بەرەو گەراج، دوا ماڵاواییم لە تریفە و براکەی کرد و دایکم بەوان سپارد.

لەوێوە بە ئۆتۆمبیلی تایبەت بەرەو فڕۆکەخانەی پایتەخت ڕۆیشتم، تا بگەمە کاتی دیاری کراوی فڕۆکەکە، بەرەو میسر.

## (٦)

یەکەمجاربوو لە نێو فڕۆکە وبە ئاسماندا بفڕم،تەواو دووركەوتینەوە لە پایتەخت ،ئەو شارە گەورەیە زۆر بچووك بووەوە، پاش كەمێ ڕۆیشتن،بە بڵندگۆی نێو فڕۆکەکە ئاگادارکراینەوە کە ئاسمانی عێراقمان جێهێشت. گەیشتینە سەر دەریای سوور، تەنیا ئاومان لە ژێردا بوو، شەپۆلی دەدا، بە سەر ئەو دەریایە ڕۆیشتین، تا گەیشتینە قاهیرە، هێدی هێدی دەنیشتینەوە، شارەکە تا دەهات گەورە دەبووەوە، تا لە فڕۆکەخانەیەکی پایتەختی میسر نیشتینەوە.سوپاسی خوام کرد،گەیشتمە ئەو شوێنەی کە زۆر لە مێژە خەونی پێوە دەبینم،لە بەشی کارگێڕیی فڕۆکەخانەکە لیستێکی لێبوو تایبەت بەو نووسینگەیەی بەڵێنمان لەگەڵیدا بوو،ناوی خوێندمەوە و بە پاسێکی تایبەت لە فڕۆکەخانەوە بەرەو ئوتێلی دابینکراو ڕۆیشتین،گەیشتینە ئوتێلەکە کە لە پلە نایابەکان بوو، یەکەمجاربوو بچمە نێو ئەو جۆرە تەلارەوە،لە ئوتێلەکە ژووری ژمارە (٦٤) یان بۆ دیاری کردم،پارەکەم بە ئامانەت لە بانکی ئوتێلەکە دانا،پسوڵەیەکم لە بری وەرگرت.

ئەو پارە (میسریانە)م کە لە عێراق گۆڕیبوو،لە گیرفانم دانا، کە زانیان پارەی زۆرم پێیە، زۆر ڕێزیان لێگرتم،کلیلی دایە دەس کوڕێ، کە ویستم جانتاکە بکەمە شانم و بەرەو ژوورەکە بڕۆم،ڕازیی نەبوو،جانتاکەی بە زۆر لێوەرگرتم و کەوتە پێشم، چووینە ژوورەوە،

هـەر ژووریّ نـەبوو، خانوویـەکی تـەواو بـوو، (گـەرماو و سـەراو)ی ڕۆژئاوایی لە نێودا بوو، هۆڵێکی بچووکی هەبوو،تێیدا تاخمێ قەنەفە ومێزێکـی لـە نێوەنـدەوە دانرابـوو،ژوورێکی دی تایبـەت بـە نووسـتنی تێـدابوو،کوڕە گەرسۆنەکە هـەموو شـتەکانی پیشاندام وپاشـان گـوتی: هیچت ناویّ ؟

گوتم: نەخێر،بەلأم ئەو وەستا و هـەر سـەیری دەکـردم ، کـە بزەیـەکی کـرد، تێگەیشتم داوای پارە دەکات،چەن جونێهێکم دەرهێنـا و پێمـدا، زۆر سوپاسـیکردم،وا دیـاربوو زۆرم پێـدابوو، لـە خۆشـیان نەیـدەزانی چیی بڵیّ،دیسانەوە بە ڕوویەکی زۆر خۆشەوە گوتی: هیچت ناویّ؟.

گوتم: نەخێر برام، تۆ دەتوانی بڕۆی.

ئەو ڕۆیشت،چوومە گەرماو و خۆم شۆری،پاشان چوومە سەر جێـی نووسـتن و ڕاکشام.هەستمکرد برسیمە،زەنگێکم لێدا،کوڕەکـە بـە پەلـە گەیشتە ژوورەکەم گوتی: فەرموو، فەرموو، چیی دەفەرمووی؟.

گوتم: خواردنی چییتان هەیە ؟

ئەویش لیستی خواردنی لە سەر مێزەکە بۆ هێنام، گوتی بیخوێنەوە، بزانم چییت پێپەسەندە ،بەڵکو بۆت بێنین.

گۆشتی بـرژاو و دوو بیرەم داواکـرد، دەسـی بـرد بـۆ هـەر دوو چاوی گوتی: سەرچاوانم، هەر ئێستە دەگات.

لە پاش نیوکاژێر، لە دەرگا درا، کردمەوە، کچێکی بالأ بەرز، قژە مۆر وخاوەکەی ڕووە پەمەیی و گـەردنی درێـژ و سـپییەکەی داپۆشیبوو، لە ڕوویـــدا زەردەخەنـــە دەباری،گالیـــسکەیەکی چـــوارتایەی پاڵـــدەنا، گالیسکەکە بـە خـامێکی زۆر پـاکو سـپیی داپۆشـرابوو،زۆر بـە نـازەوە گوتی: ئەمە خواردنەکەی جەنابتانە.

گوتم: فەرموو بیهێنە ژوورەوە.

لەگەڵ پاڵ نانی گالیسکەکە،جووڵەو ڕۆیشتنەکەی لە چەشنی سەمایێ بوو، بە ئاوازی مۆسیقایێ هێمن.

لە بەردەم قەنەفەکە وەستانی و فەرمووی لێکردم دانیشم،هەر کە دانیشتم،پەردەی لە سەر گالیسکەکە لابرد،خۆی بە تەواوی چەماندبووەوە و دوو مەمی سپیوسۆڵی دەرکەوت، هێند توندبوون، لەگەڵ جوڵانەوەیدا دەلەرییەوە،بە زوویی ڕووم وەرگێڕا، تا پتر تەماشا نەکەم،بەڵام ئەو بە نازێکەوە گوتی: هیچ ئیشی دیکەت نییە؟

گوتم: سوپاس.

خۆی لێنزیککردمەوە، گوتی: هەر سوپاس.

زانیم مەبەستی پارەیە، چەن جونێهێکم پێدا، بە زەردەخەنەوە خستییە نێوان هەر دوو مەمیەوە و بە نازەوە و بە سەمایەکی تایبەتەوە کە پێدەچوو پرۆڤەیێ زۆریان لە سەر ئەم ڕۆیشتنە پێکردبێ ، چووە لای دەرگاکە ، زەردەخەنەیەکی کرد و چووە دەرەوە. منیش دەسمکرد بە نانخواردن،چونکە سەرنجی ڕاکێشابووم، دیمەنی لە پێشچاوم وون نابوو.پێکێ بیرەم هەڵدا، لە دوا پێك زەنگێکم لێدا، ئەمجارەیان کچەکە هاتەوە،بەڵام خۆی جوانتر کردبوو، جلێکی تەسکتری لەبەر کردبوو، مەمەکانی تەواو هەڵاوسابوونە دەرەوە.

گوتم: گالیسکەکەت ببەوە.

لێمنزیکبووەوە،دەیویست دابنیشێ، بەڵام گوتم: فەرموو گالیسکەکەت بەرەوە.سینەی هێنایە پێشەوە و گوتی:من لوبنانییم،جوانی وەك منت بینیووە،من لە سەرم شەڕدەکەن، کەچی تۆ خۆت دووردەگری و ناتەوێ ئەم شەو لەگەڵم ڕابوێری. یەکەمجارمبوو

یەکێ بیەوێ ڕابواردنی سێکسی لەگەڵدا بکەم،چاو لە سەیرکردنی تێر نەدەبوو،دڵم پتر لێیدەدا، نەمدەزانی چیی وەڵام بدەمەوە،کەمێ چوومە دواوە.گوتم: فەرموو برۆ کارم پێت نییە.

گوتی: کەواتە بەخشیم بدەرێ.

دەسم خستە نێو گیرفانم ،چەن جونێهێکم دەرهێنا،کە ویستم بیدەمێ وەری نەگرت، گوتم: ئەی بۆ وەریناگری،چاوی لێداگرتم و زەردەخەنەیەکی کرد، تێگەیشتم دەڵێت بیکەرە نێوان مەمکمەوە.گوتم: گەر وەری ناگری ناتدەمێ،بە پەلە لێیوەرگرتم و بە پێکەنینەوە خستییە نێو مەمانی و ڕۆیشتە دەرەوە.

ئارەقەم کردبوو،جوانیی ئەو کچە لوبنانییە کاری تێکردم،هەستیی بزوانم،بەلام هەر چەن کاریگەربێ، چونکە بۆ کارێکی پیرۆز هاتبووم، نەمتوانی ناپاکی بکەم، لەبەر ئەوە پلانم دانا چۆن بتوانم خوشکەکانم و ئەو کچانەی دیکەی ئەنفالکراوی فرۆشراو بە میسر،بدۆزمەوە.

بەیانی بە ئاگا هاتم کاژێر لە ٩ی بەیانی بوو،پاش خۆشۆرین، چوومە هۆلی چێشتخانەی ئوتێلەکە و نانی بەیانیم خوارد ،پاشان بۆ نێو بازاڕی قاهیرە چووم، ئەو وولاتە بە هەژارترین وولات دەژمێردرا، کەچی جوانترین و باشترین تەلاری تێدابوو، تەماشای هەموو خەڵکیم دەکرد.بە تایبەت (کچان) ،دەمگوت دەبێ لە پڕێکدا خوشکەکانم نەبینمەوە، گەر وا بوایە ئاخۆ چییم دەکرد،چاوم زۆر دەگێڕا، لە ناکاو نوسراوێکم خوێندەوە، (ملهى الملتقى..تیاترۆخانەی ئە لمولتەقا)، دڵم خۆشبوو، گوتم: شەوێ تا درەنگ لە قوژبنێکی مەلهاکە دادەنیشم و سەیری کچان دەکەم، گەر خوشکەکانیشم نەبن، هەر شێوەی کچە کوردێ بێ، خۆمی پێدەناسێنم ، بەڵکو لە کچە ئەنفالەکان بن.

زۆر پەلەم بوو کات بڕوات و بگەمە شەو، بەڵکو لە یەکەمین پلان و هەنگاو بەرەو ئەو کارە پیرۆزەی بۆی هاتووم،سەرکەوتووبم،تا بە زووترین کات بچمەوە ئامێزی نیشتمان،بە دایکم و هاوڕێکانم شادبمەوە.

## (٧)

گەیشتمە شەو، لە ئوتێلەکە هاتمە دەرەوە، لە نێو بازاڕ دەڕۆیشتم، بازاڕ چراخان بوو،زۆر ڕووناکبوو،نزیکی مەلهاکە بوومەوە،دەترسام، نەمدەزانی چۆن ڕەفتاربکەم لە مەلهادا،چونکە یەکەمینجارە بچمە ئەو جۆرە شوێنە،بەڵام کەمێ زانیارییم لەو فیلمانەوە وەرگرتبوو کە بینیبووم.لە دەرگای مەلهاکە چوومە ژوورەوە،کچێ پێشوازیی لێکردم، زۆرجوان نەبوو،بە ڕوخساریا زانیم میسرییە ،فەرمووی دەکرد و دەیویست خۆی بکات بە هاوڕێم،تا خواردن و خواردنەوەی ئەو شەوەی لە سەرم بێ،بەڵام من گوتم:شوێنێکم دەوێ تەنیا خۆم بم.

لە سوچێکی مەلهاکە مێزێکی بە تاڵی لێبوو،دانیشتم،گەرسۆنەکە هات و خێرهاتنی لێکردم و گوتی:فەرموو لە خواردن و خواردنەوە،کچی جوان، چییت دەوێ بێژە،تا بیکەمە سەرچاوان.

گوتم: دوو بیرەم بۆ بێنە، لەگەڵ مەزەی زەیتوون.

گوتی:کچ بێ دانیشێ بۆ ڕابواردنت.

گوتم: نەخێر، نامەوێ.

سەری دانەوان و ڕۆیشت،دوو بوتڵی بیرەی زۆر ساردی هێنا،لەگەڵ قاپێکی پڕ لە زەیتوون.دوو پێکێکم هەڵدا،ئیدی بە ئارەزووی خۆم سەرنجمدەدا،تەماشای ئەو کچانەم دەکرد کە هێندێکیان( لە سەما، هەبوو لە ئامێزی کوڕێك یا پیاوێکی کامڵدابوو).چاوم دەگێڕا لە یەکێ بە کورد بچێ.لە پڕ جوانێکی بێوێنە، باڵا بەرزێکی قەشەنگ،چاو شینی

کالْ،ڕەنگی سوور و سپیی،هاتە نزیکمەوە وەستا،بە خەندەوە گوتی: دانیشم؟ڕوانیمە سەراپای،بە (عارەب) نەدەچوو.بە زمانی خۆمان گوتم،دانیشە.

دووبارە گوتی: دانیشم.زانیم زمانی میسریی نییە.

هەربۆیە گوتم:فەرموو دانیشە.هەرکە دانیشت بانگی گەرسۆنەکەم کرد،تا بێ و داواکاری کچەکە بێنێ،بەلاّم زۆری داواکرد، لەوەی خۆم زۆر تربوو.

گوتم: دەزانی لە خۆم پترت داواکردووە؟.

بە نازەوە سەرنجێکیدام گوتی:ئەی جوانێکی وەك من،ئەمانەی پێڕەوا نابینی.

گوتم:زۆرڕاستە،بە ڕاستی جوانی، شێوەت بە میسریی ناچێ،هەروەها قسەکردنەکەت.

گوتی: میسریی نیم.

گوتم:ئەی تۆ خە ڵکی کوێی؟.

گوتی:من ڕۆمانییم،پەرداخەکەی پڕکرد،منیش پەرداخەکەم لەبەر دەسدابوو،پەرداخی بەرزکردەوە،منیش پەرداخەکەم بەرزکردەوە، لێکماندا وخواردمانەوە،چەن پێکێکمان پێکەوە خواردەوە،کە سەیری خەڵکەکەم دەکرد،هەموو خەریکی،سەما،خواردنەوە،ڕابواردن لەگەڵ یەکدیا بوون.

جگەرەیەکی خستە نێوان لێوەکانی و سەرنجیدام،زانیم دەبێ بۆی داگیرسێنم، یەکسەر چەرخەکەم پێکرد و نزیکم خستەوە لە جگەرەکەی لەگەڵیدا دوو مژی لێدا و دایگیرساند،چەن مژێکی دیکەی لێدا و دووکەڵەکەی فڕێدایە ئاسمان،منیش جگەرەکەم داگیرسان ،چەن پێکێ

دیکەم خواردەوە،تیپی مۆسیقاش ئاوازێکی زۆر خۆشیان لێدا، هەموو هەر سەمای دەکرد،ئەوەی لە گۆڕەپانی سەماشدا نەبوایە لە سەر کورسییەکەی خۆی بادەدا و سەمای دەکرد،کچان و کوڕان گەرمببوون،کە سەیری چواردەورم دەکرد،سەما، دەم لە نێو دەمان و یاریکردن زۆر ئاساییبوو،کەس سەیری کەسی نەدەکرد،کچە ڕۆمانیی تەواو لێمنزیکبووەوە،دەسی خستە ملم،خۆی پێوە نووسانم، موچڕکی بە لەشدا هێنام،خۆم دوورخستەوە بەڵام بێسوودبوو،هەستا و هاتە نێو باوەشم،هەردوو دەسم وەك (دیل) بەرز ڕاگرتبوو،دەترسام، شەرمم دەکرد باوەشی لێبدەم،خەریکبوو لە نێو ئامێزم بکەویٚ،ناچار باوەشم لێدا و پشتیم ڕاسکردەوە،ئەویش دەسی لە ملکردم ،بە دەرکەوتنی مەمانی پتر سەرنجی ڕاکێشام،چاوەکانی لە چاوم بڕیبوو،چاوێکی ئاوی، بە خواردنەوەکەش پتر چاوی مەستببوو،لێوی هێنایە پێش،دیسانەوە سەیرێکی خەڵکەکەم کرد، تێکئالأبوون،کەس تەماشای نەدەکردین،کە ڕووم کردەوە بە لایەوە،لێوەکانی خستە نێو دەمم،شەرم نەما ، دەسمکرد بە مژینی لێوەکانی،زۆرمان ڕابوارد،لە پڕ هاتمەوە هۆشیخۆم، من بۆچی هاتووم و تووشی چیببووم،هاتە خەیاڵم کە چۆن ئێستە من ڕادەبوێرم،لەوانەیە خوشکەکانم بەم شێوەیە ڕابواردنیان لەگەڵدا بکریٚ. لە پڕ لە باوەشم لامبرد، بە کلێنسی سەر مێزەکە ئارەقی پەشیمانی و شەرمەزارییم سڕییەوە،دڵم دەلەرزی،دەسم بۆ پێکەکەی بەر دەسم برد و هەڵمدا،ئەویش کەمیٚ زویر دیاربوو،چونکە هیچ کەس لە ڕابواردن لە گەڵیدا بێزار نەدەبوو،چەن کەوچکیٚ لە مەزەکەی خوارد و دوا پێکی هەڵدا و پاشان جگەرەیەکی خستە نێو هەر دوو لێوی و سەرنجیدام کە بۆی داگیرسێنم،بەڵام نەمکرد،بە ناچاری دەسیبرد بۆ

چەرخەکەی سەر مێزەکە و دایگیرسان،چەن مژێکی لە جگەرەکەیدا، لە ناکاو گەشبووەوە بۆ ئەو دوو گەنجەی کە هاتنە نێو مەلهاکەوە،دوو لاوی قات لەبەری بالآبەرز،زۆر قۆزبوون،دیاربوو لە زەنگینەکانی ئەو شارە بوون،لە شوێنێ دانیشتن هەر چاویان دەگێڕا،ئێمەیان بینی، دەسیان بۆ کچە ڕۆمانییەکەی لای من هەڵبڕی،ئەویش دەسی بۆ بەرزکردنەوە،حەزیدەکرد بۆ لایان بڕوات،بە زەردەخەنەیەکەوە سەیرێکی کردم و گوتی:بە یارمەتیت بۆ لای ئەوان دەچم،چونکە هاوڕێی هەمیشەیی منن.

گوتم: بڕۆ.

گوتی: گەر پەلەت نەبێ بۆ لات دێمەوە.

گوتم: پێویست ناکات، من دەڕۆم.

هێدی هێدی بەرەو لایان دەڕۆیشت.

منیش دوو مژم لە جگەرەکەمدا و لە نێو تەپڵەکەکە کوژانمەوە ، چەن فڕێکم لە ژێر پەرداخەکە مابوو،ئەویشم هەڵدا ،بانگی گەرسۆنەکەم کرد تا بزانم پارەکەی چەن دەکات.

ئەویش چوو هەژماردەی کرد،هاتەوەو پارەکەمدا.دوا سەرنجی خەڵکیمدا، بەلآم ئەوەی مەبەستم بوو تێیدا نەبوو.

گەرسۆنەکە گوتی:چاو لە کێ دەگێڕی.

گوتم: لە کەس، دەڕۆم.

گوتی: کچت ناوێ لەگەڵتدا بێ.

گوتم:نەخێر،نامەوێ،بەلآم یەکسەر پەشیمانبوومەوە،گوتم: دەمەوێ.

گوتی:میسریی.. ڕۆمانیی.. لوبنانیی.. تونسیی.. هیندیی.. عێراقیی، ئەڵمانیی،چ جۆرێکت دەوێ دەسدەکەوێ.

گوتم:گەر عێراقیی هەبێ دەمەوێ.

گوتی:ئەو کچە عێراقییەمان هەیە، وا لە ئامێزی ئەو پیاوەیە، هەر کە تەواو بوو بۆت دەنێرم.

تەماشامکرد،ڕەشێکی لچ ئەستور،زانیم خەڵکی باشوورە و خەڵکی لای ئێمە نییە و عارەبە،هەر بۆیە گوتم: سوپاس،زۆر ماندووم، کچ نابەم لەگەڵ خۆم. تا دەرگا بە ڕێی کردم.

چوومە دەرەوە، وامدەزانی لە خەونێکدا بووم و ڕاچڵەکیووم، بەهای جوانی مرۆڤ زۆر بێنرخ هاتە پێشچاوم،کە بە چەن پارچە کاغەزێ لە پارە،فریو دەدرا.لەشی جوانیی خۆی دەفرۆشت.

پتر پەرۆشی کچانمان بووم کە فرۆشراون بەم چاوچنۆك وداوێنپیسانە. ئەو شەوە خۆم لەبەرچاو کەوت کە ڕابواردنم لەگەڵیاندا کرد،تفم لە خۆدەکرد، بۆ چ کارێکی پیرۆز هاتووم و تووشی چییبووم و چییم کرد. مرۆڤم زۆر بە لاواز هاتە پێشچاوم لەو مەلهایەدا ،بێئەوەی خۆشەویستیی لە نێو دڵەکاندا بێ، کات بە سەر دەبەن.کچێکە و لەگەڵ چەن پیاوێ ڕابواردن دەکات، پیاوێکە و لەگەڵ چەن کچێ ڕادەبوێرێ، ئاخۆ خۆشەویستیی لە کوێدا خۆی دەبینێتەوە،وەك ئاژەڵان پەلاماری یەکدیدەدەن بۆ ڕابواردنێکی کاتی،بە دەر لە سۆز و خۆشەویستیی.

هەر بۆیە بڕیارمدا لە مەلهاکان تەنیا  یەك بیرە بخۆمەوە،لە نیو کاژێر پتری تێدا نەبم و بە هیچ شێوەیێ بانگێشتی کچان نەکەم بۆ سەرمێز،تاجوانتر و باشتر بتوانم بگەمە ئەو ئامانجەی بۆی هاتووم و پیرۆزی کارەکەم بپارێزم،ئەو بڕە پارەیەی  لە پێناو دۆزینەوەی کچانمان خەرجکراوە،بە فیڕۆی نەدەم وبۆ خۆشی خۆم خەرجی نەکەم.

## (٨)

پازدە ڕۆژ لە قاهیرە بووم، زۆربەی مەلهای ئەو شارە گەڕام ، کچە کوردێکم نەبینی، بیرمکردەوە،وا چاکە بە کچە لوبنانییەکە بڵێم کچی عێراقیی لە چ شارێکی مەلهاکانی میسر بە زۆری کاردەکەن،لەبەرئەوە تێلیفۆنم بۆ کارگێڕی ئوتێلەکە کرد،تا کچە (لوبنانییەکە)م بۆ بنێرێ. یەك چارەك کاژێری نەخایاند،بە شێوەیێ زۆرجوان و سەرنجڕاکێش خۆی گۆڕیبوو،وایدەزانی ئەمشەو ناڕۆمە دەرەوە و بۆ کاری سێکسی بانگمکردووە. بە نازێکەوە گوتی:زانیم شەوێك بانگمدەکەی،چونکە هەر کەسێ هاتبێ بۆ ئەم ئوتێلە،شەوێ بانگیکردووم بۆ ڕابواردن و بە سەربردنی شەوی،هەر بۆیە خاوەن ئوتێلەکە ناهێڵێ بۆ لوبنان بچمەوە، چونکە دەزانێ هەر کەسێ لە بازرگان و زەنگینەکان،یەك جار هاتبن و شەو لەگەڵیاندا بوویم،هەر ڕێی بکەوێتەوە قاهیرە دێتەوە بۆ ئەم ئوتێلە،تەنیا لەبەر ئەو ڕابواردنە خۆشەی شەوێ لە منی دەبینێ. لێمهاتە پێشەوە،بە نازێکەوە گوتی:دوو هەفتەیە تۆ لەم ئوتێلەی،تا ئێستا نازانی من ناوم (دونیا)یە.

گوتم:خۆشحاڵم،بەڵام (دونیا) دەزانی من بۆچی بانگمکردووی؟.

بە ڕوویێ گەشو پڕ لە سۆز وخەندەوە گوتی:دەڕۆیتەوە، ناتەوێ بێڕابواردنی شەوێ لەگەڵ من، لە دەس خۆتبدەی و بڕۆیتەوە،چونکە دەزانی جوانی وەك من لای خۆتان نییە.

گوتم:ئێمە زۆر جوانمان هەیە ولە تۆش جوانتر،بەڵام وەك تۆ جوانییەكانیان بێبەها نییە ولەشی خۆیان نافرۆشن.تۆ جوانییەكەت بۆچی بە پارە دەفرۆشی،هەر ڕۆژی لە باخەڵی داوێن پیسێكدای، تۆ مرۆڤی،دەبێ هێند بەهای جوانییەكەت پیرۆزبێ،خۆت پێشكەشی هەموو كەس نەكەی،دەبێ خۆشەویستیی فێربی ،ببی بە هاوسەری ئەو كەسەی خۆشیدەوێی و خۆشتدەوێ،ببیتە دایكێكی میهرەبانیی پیرۆز بۆ ئەو كۆرپە پاكوبێگەردەی لەو هاوسەرە خۆشەویستەت دروسدەبێ.

زۆر كپ و بێدەنگبوو،زەردەخەنە لە سەر لێوانی نەما،ڕەنگی گۆڕا، ڕەنگی شەرماوی لێنیشت،جووت مەمی كە حەزیدەكرد پتر دەریبخات ، دەیویست بیشارێتەوە،سەیرێكی كردم،چاوەكانی لە فرمێسكدا قەتیس مابوون،حەزیدەكرد قسەبكات،بەڵام بۆی نەدەهات،تێگەیشتم ئەم كچە بەسەرهاتێكی نهێنیی لە پشتیەوەیە.

گوتم:قسەكانم ڕاستن،یا من هەڵەم؟.

هاتە قسە وگوتی:دەزانی تا ئێستە هەستم نەكردووە مرۆڤێ بەزەیی بە مرۆڤێكدا بێ و ئامۆژگاریی بكات و ڕێی ڕاستیی پیشاندا،هەر كەسە و لە پێناو خۆشی ورابواردنی خۆی ئەوی دی لە بیر نییە،نازانم هەر لەم شوێنانەی من كاری تێدەكەم كەسەكان هەستی مرۆڤایەتییان نییە یا هەموو شوێن بەم شێوەیەیە؟.

گوتم:نەخێر،هەموو شوێنێ وا نییە،پێشێلی مافیی مرۆڤ كاری ئاسان نییە.

گوتی:لە وڵاتە پێشكەوتووەكان ئەم جۆرە ڕابواردنانە بە پێشێلی مافیی مرۆڤ نازانن،بە سەربەستیی و سەربەخۆیی مرۆڤی دەزانن.

گوتم:ڕاستە مرۆڤ دەبێ سەربەستبێ، بەڵام نەك خۆشەویستیی لە بیربچێ وتەنیا دامرکانەوەی حەز وئارەزووە سێکسیەکانی مەبەست بێ، بەردەوامبووم لە قسەکردن وگوتم: ئایا تۆ لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی شەوانەت بەسەر دەبرد،خۆشەویستییان دەزانی؟.ئایا بەرانبەریان تۆزقاڵێ خۆشەویستییت لە دڵبوو؟یا حەزت دەکرد بە زوویی ڕابواردن تەواوبێ وپارەکەت وەربگری وخاوەنی ئوتێلەکەش ئافەرینێکت بکات.

سەری داخست،سەیری نەدەکردم،کەوتە نێو خەیاڵەوە،چەن دڵۆپێ فرمێسکی بە ڕوومەتەکانی هاتە خوارێ و گوتی:من بە ئارەزووی خۆم بۆ ئەم شوێنە نەهاتووم،لە پێناو باوکودایك وچوار خوشکمدا هاتووم.

جگەرەیەکم داگیرسان و مژێکم لێدا گوتم:بۆچیی؟.

گوتی:حەزدەکەم باسی بەسەرهاتم بکەم،بەڵام دەبێ نهێنییەکەم بپارێزی.

گوتم:من دەرچووی (کۆلێژی توێژەریی کۆمەڵایەتییم).سوێند دراوین نهێنیی پارێزبین.دڵنیاشبە،کارەکەی خۆم زۆرلا پیرۆزە.

گوتی:دڵنیام،من دوو هەفتەیە سەرمسوڕماوە،چونکە تۆ وەك خەڵکانی ئێرە نابینم،مرۆڤ دۆستومافناسیی،هەر لەبەر ئەوە باسی بەسەرهاتی خێزانەکەمت بۆ دەکەم،وا دەزانم بۆ کەسێکی خۆمی باسدەکەم،ئەوسا بۆت دەردەکەوێ،چ گوڵێکی پاکوبێگەرد بووم،چۆن ناپاك و داوێنپیسان هەڵیانوەرانم.

مژێکی دیکەم لە جگەرەکەمدا گوتم:فەرموو گوێم لێتە، باسی بەسەرهاتەکەت بکە.

گوتی: "من فێرخوازێکی پۆلی چوارەمی ئامادەیی بووم، باوك و دایك و پێنج خوشك بووین،باوکم زۆر دەوڵەمەند بوو،بە هیچ شێوەیێ

بێدڵی نەدەکردین،دووخوشك لە خۆم گەورەتر،دوانی بچوکتربوون،بەڵام هەموو لە قوتابخانە بووین،ئاستمان زۆر بەرزبوو،ئەوەی جێی داخە بە هۆی شەڕی ناوخۆی لوبنانەوە،باوکم تووشی زیانێکی ماددیی زۆرهات، بە ناچاری قەرزی لەم خاوەن ئوتێلە کرد،چونکە زۆر هاوڕێی بوو،تا بتوانێ بە مامەڵەی بازرگانی زیانەکانی پڕکاتەوە،بەڵام دیسانەوە بە ڕێکەوت تووشی زیانێکی ماددیی دیکە بوو،هەر خوا بەزەیی پێکردین کە خۆیشی نەفەوتا.هیچمان نەما،تەنیا ئەوخانووە نەبێ تێیدا دەژیاین،کەوتینە ژێر قەرزی ئەم خاوەن ئوتێلە، کە زۆر دەوڵەمەندە خەڵکی لوبنانە و ئەم ئوتێلە پلە یەکەیشی هەیە،ئەم پیاوە چاوچنۆك و داوێنپیسە،داوای قەرزەکەی لە باوکم کرد،بەڵام باوکم نەیبوو بیداتەوە،زۆر بێزاریکردین،ڕۆژێکیان بۆ ماڵ هات و گوتی:دەتوانن خانووەکەتان بفرۆشن،قەرزەکەم بدەنەوە،گەرنا،ئەوا سکاڵا دەگەیەنمە دادگا.

باوکم گوتی:تۆ زۆر دەوڵەمەنی و پێویستت بەو قەرزە نییە،کەمێ چاوەڕوانبە تا چارەیێ دەدۆزمەوە.

گوتی:لەبەرئەوەی هاوڕێم بووی،یەك هەفتەی دی مۆڵەتت دەدەم.

سەرمان لێشێوابوو،خوێندنمان لە پێش چاوکەوتبوو،نەماندەزانی چییبکەین وچۆن لەم قەرزارییە ڕزگاربین.ئەو هەفتەیە خواردنمان ژەهری مار بوو،هەر کە لە دەرگا دەدرا دڵمان ڕادەچڵەکی.

هەفتەمین ڕۆژ،بە ئۆتۆمبیلێکی دوا مۆدیل هاتە پێش دەرگا،چەن کەسێ لەگەڵیدا بوون ولە دەرەوە وەستابوون،باوکم ڕەنگی زەردبوو، قسەی بۆ نەدەکرا،قوڕگی ووشکبوو،نەیدەزانی چۆن فەرموویان

لێبکات، چۆن دانیشیٚ لەگەڵ خاوەن قەرز.هەر کە دانیشتن، بێشەرمانە گوتی: قەرزەکەم ئامادەیە.

باوکم گوتی:نەخێر، دەتوانی ئێستە بمگەیەنیتە دادگا،چونکە بە فرۆشتنی خانووەکەش ناتوانم قەرزەکەت بدەمەوە،پاشان خانوو بفرۆشم بۆ کویٚ بچم؟.

گوتی: بچۆرە خێمەوە،هەر وەك ئەو لوبنانیانەی لە خێمەدان.

باوکم گوتی:توخوا لە منداڵەکانم تێکمەدە،یا ئێستە دەچین بۆ دادگا، یا لە بری قەرزەکەت بۆ قاهیرە دێم لە ئوتێلەکەت کاردەکەم.

ئەم چاوچنۆکە بە پێکەنینەوە،بە شێوەییٚ زۆر ناشیرین و گاڵتەپێکردنەوە گوتی: تۆا تۆ لە ئوتێلەکەم کاربکەی؟!!.

دایکم گوتیٚ:گەر بەو ڕازی نابی،من دێم کاردەکەم.

گوتی:ئوتێلەکەم بە ناوبانگترین ئوتێلە لە قاهیرە و پلە یەکە، کام کچی جوانیی جیهان هەیە،تێیدا کاردەکەن، ئێستە من ئێوە دەبەم.

من وخوشکەکانم دەگریاین،زۆر بەزەییمان بە باوکم دەهاتەوە، کە چۆن قەرزار بەر دەرگای گرتووە وهیچ چارەسەرێکی نییە،بە هەموو شتێکی ئەم چاوچنۆکە ڕازییە.هەموو بێدەنگ،وەك ئەوەی لە چاوەڕوانیی دوا بڕیاری دادگابین.لە پڕ گوتی:تۆ پێنج کچت هەیە،یەکیان بابیٚ بۆ ئوتێلەکە ولە بری قەرزەکە کاربکات،چونکە تۆ هاوڕێی کۆنی منی، حەزناکەم ڕوو لە دادگا بکەم.

باوکم گوتی: من حەزدەکەم خۆم لە بەندیخانە بم، بەڵام کچەکانم لە نێو ئەم خانووە بمێنن و قۆناغی خوێندنیان تەواوبکەن.

دایکم دووبارە گوتییەوە:من یا مێردەکەم دێین،خزمەتی ئوتێلەکەت دەکەین.

به توورەبوونەوە گوتی:ئەوانەی لەوێدا کاردەکەن کچن و تەمەنیان لە نێوان پازدە ساڵ تا بیستوپێنج ساڵدایە، تەنیا ڕێگەچارە،ناردنی کچێکتانە بۆ کارکردن.

سەرنجی باوکمدا،ئازار وناخۆشیی و دڵتەنگی لە روویدا دەباری، هەستمدەکرد، لە ناخییەوە هاواری بۆ بەزەیی،ئاوڕ لێدانەوەیەکی مرۆڤایەتیی دەکرد.لە ناکاو بە مێشکمدا هات،بۆ لە پێناو باوکودایك و هەر چوار خوشکەکەم،نەڵێم من دێم کاردەکەم،کە هەموو بێدەنگبوون،گوتم:من ئامادەم لە ئوتێلەکەت کاربکەم،بە مەرجێ لە قەرزەکان باوکم خۆشبی.

زۆر دڵی خۆشبوو، بێشەرمانە،لە پێمەوە تا تەوقی سەرم سەیری کردم، سەریسوڕمابوو لە جوانییەکەم وگوتی:تەنیا یەك ساڵ کار بکەی، لە قەرزەکەم خۆشدەبم.

باوکم هاواریکرد،گوتی:نا، توخوا، نا،کچەکانم بۆ ئەو جۆرە ئوتێلانە نابن،خۆم ئەو شوێنانە باش دەناسم و شارەزام.

هەستا و گوتی:قسەی کچەکەت زۆرجوانە،چارەسەرێکی تەواوە و من ڕازیی دەبم،بە هیچ چارەسەرێکی دی ڕازیی نییم ،تا دوو ڕۆژی دیکە لە لوبنانم،گەر ڕازییبوون،کچەکەت لەگەڵم دەبەم،گەر نا لە بەندیخانە بەندت دەکەم. جێیهێشتین و ڕۆیشتن.

ئەبڵەقبیووین،ناخۆشیی و ترس ڕووی داپۆشیبووین،باوکم ڕووی تێکردم گوتی:دونیا بۆ ئەو قسەیەت کرد،ئەمانە چاوچنۆکن، بێ ئابڕوون.

گوتم:باوکە گیان تۆ زۆر هەوڵت بۆ داوین،ئێستەش لە نێو کێشەدای، من ئەوڕۆ فریات نەکەوم،ئەی کەی بتوانم هاوکارییت بکەم؟.

باوکم گوتی:من ناتوانم کچم بدەمە دەس ئەم داوێنپیسانە.

خوشکەکانم و دایکم گوتیان:دونیا لە بەرژەوەندیی هەمووان ئەم کارە دەکات،کەس زۆری لێنەکردووە،بە ئارەزووی خۆی ئەم بڕیارەی داوە.

باوکم گوتی:بە ڕاستی زۆر گرانە وهیچ کاتێ لەو بڕوایەدا نەبووم ڕۆژێ بێ و کچم لە قوتابخانە دەربکەم و کاربکات.

گوتم: باوکە گیان تۆ باوکێ زۆرچاکی،زۆر باوکی دی هەیە بێئەوەی قەرزاریش بێ،کچەکەی بۆ کارکردن دەنێرێ،دەسەکانیم ماچکرد و گوتم:دڵنیابە باوکەگیان من دەچم کاردەکەم،ئابڕووی خۆمیش لەم چاوچنۆکانە دەپارێزم،باوکە گیان تۆ دڵ و گیانی ئێمەی،ئێمە بێ تۆ دونیامان بۆچییە،ئەی لە بیرت چوو کاتی دەوڵەمەندیت هەرچییمان دەویستوداوامان دەکرد،دەست بۆ چاوەکانت دەبرد و دەتگوت بە چاوان. زۆر بەزەیی بە خۆیدا هاتەوە گریا،زۆر گریا،ئێمەیشی کردە گریان، چاوەکانی سڕییەوە،گوتی:سوپاستاندەکەم جگەرگۆشەکانم،منیش بێ ئێوە دونیام ناوێ.

تێلێفۆنەکەم هێنایە بەردەسی و گوتم: هەرئێستە پێوەندیی پێوەبکە و بڵێ هەر کاتێ بۆ قاهیرە چووی، وەرە و کچەکەم لە بری قەرزەکە بۆ کارکردن ببە.

باوکم گوتی:کچەکەم ناتوانم بە هیچ شێوەیێ ناتوانم.بەڵام هەموو لێیکۆبووینەوە و بە پێکەنین وگاڵتەوگەپەوە گوتمان. توخوا باوکە ژمارەی تێلێفۆنەکەی لێبدە.

گوتم: باوکە من بۆ کارکردن دەچم،ئەمە دەبێ ناخۆشی چییبێ؟.

گوتی:کچەکەم ئێوە ئەمانە ناناسن،چ بێئابڕوون.

گوتم:باوکە گیان،هیچ کەس ناتوانیّ جگە لەو کارەی بۆم دیاری دەکریّ، کاریّکی دی ناشیاو و نابەجیّم پیّبکات.

باوکم لەبەر دڵی ئیّمە بە دەسە لەرزۆکەکەی ژمارەی تیّلیّفۆنەکەی لیّدەدا.

(دونیا) پتر نەیتوانی بەردەوامبیّ لە باسکردنی بەسەرهاتەکەی، گریان قورگی گرتبوو،دڵی منیشی پڕکرد لە بەزەیی و سۆز.چەن دڵۆپیّ لە فرمیّسکی پاکوبیّگەردی بە رووومەتیدا هاتە خواریّ،بە پەلە سڕی، ئیّستیّك بیّدەنگبوو،پاشان هەناسەییّ ناموّیی هەڵکیشا و گوتی:باوکم لەگەڵ لیّدانی هەر ژمارەییّ،رەنگی بە چەندین شیّوە دەگۆڕا،لە لیّدانی دوا ژمارە،تیّلیّفۆنەکەی نایە بنگویّی و بە چاوەکانی تەماشایدەکردین، لیّدانی دڵەکەی بە ئاشکرا دەردەکەوت،هەناسەی تەنگببوو، لە پڕ باوکم کەوتە قسەکردن گوتی: (ئەحمەد) تۆی؟

هەموو نزیکبووینەوە لە باوکم و گویّمان هەڵخستبوو،باوکمیش کردیە (بڵندگۆی دەرەکی_سەماعەی خارجی).

ئەحمەدی چاوچنۆك گوتی:بەڵیّ فەرموو، وا دیارە گەیشتوونەتە چارەسەر، بۆیە پیّوەندیی دەکەی.

باوکم گوتی:ئەحمەد، لیّتدەپاڕیّمەوە،ماوەیەکی دی مۆڵەتم بدە، تا بتوانم قەرزەکەت بدەمەوە.

گوتی:ماوەیەکی دیکەیش هەر ئیّستەیە،گەر چارەسەرت لا نییە، ئەوا تیّلیّفۆنەکە دادەخەم،بە توورەییەوە گوتی کچەکەت چارەسەریّ باشی هەبوو،بۆ ڕازیی نابی،من جگە لەوەی لە بری قەرزەکە کاری پیّدەکەم، مانگانەیەکیش بۆ بژیّوی ژیانتان دەنیّرم.

باوکم بە هەناسەیەکی تەنگ وساردەوە ،بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: چ کات دەتەوێ کچەکەم بێ.

گوتی:تۆ دوو قسەی وا بکە، سبەینێ پاسپۆرتی تەواو دەکەم و دوو سبەی بە فڕۆکە بەرەو قاهیرە دەچین.

باوکم گوتی:بەڵام (ئەحمەد) لێتدەپاڕێمەوە،بە کچی خۆتی بزانی، لە بێئابڕووان و چاوچنۆکانی بپارێزیی.

گوتی:دڵنیابە،بەڵام ئەوڕۆ با بچێ وێنەی بگرێ، تا سبەینێ پاسپۆرتەکەی تەواوبکەم.

ئەوەی زۆر لە دڵمدا گرێیی گەورەبوو،ماڵاوایی کردنبوو لە باوك و دایك و هەر چوارخوشکم، هێند پەرێشانبوون،وەك ئەوەی مردبم و لاشەکەم بەرەو گۆڕستان بەرن،تا سواری ئۆتۆمبیلی ئەم ئەحمەدە بێئابڕووە بووم، چەندینجار باوەشم لێدەدرا و فرمێسکیان دەڕژان، منیش لەبەر گریان و ئەو دیمەنە دڵتەزێنە،هیچ قسەم بۆ نەدەکرا، حەپەسابووم ولاڵی کردبووم.

لە کاتی ڕۆیشتندا بوو، (ئەحمەد) بە باوکی گوتم: خەمت نەبێ، وەك کچی خۆمە. هەر کەسێ دیکە بوایە و ئەم دیمەنەی ببینیایە، لە هەموو قەرزەکانی خۆشدەبوو، بەڵام ئەم جۆرە کەسانە بێویژدان و خۆپەرستن.

کە گەیشتمە ئەم ئوتێلە، لە پاش تەواوبوونی ئەو کارەی پێیان سپاردبووم، دەچوومەوە ژوورە تایبەتەکەی خۆم، ئەم داوێن پیسە بێئەوەی بیر لە هاوڕێیەتیی و دوا ووتە و پەیمانی بۆ باوکم بکاتەوە، ڕۆژانە ناپاکانە سەرنجی دەدام،بزەیەکی بۆ دەکردم، لەبەر جوانییەکەی ئەوسام،زۆر کەسی دیکەش چاوچنۆکانە سەیریان دەکردم.

شەوێکیان لە ئوتێلەکە مایەوە، داوای خواردن و خواردنەوەی کرد کە من بۆیبەرم، ناچارخواردنەکەم بۆ برد، قسەی خۆشی لەگەڵ دەکردم، باسی هاوڕێیەتی خۆی وباوکمی بۆدەکردم، منیش لەگەڵ باسکردنەکەیدا گریان گرتیمی، (چونکە باوکم تووشی نەخۆشییێ کوشندە ببوو).درێژەی بە باسکردنەکەی دەدا، بە چاوچنۆکییەوە تەماشای سەراپای دەکردم، چاوم دادەخست و حەزم بەو سەیرکردنەی نەبوو.ئینجا گوتی لەگەڵم دانیشە نان بخۆ.

گوتم: برسیم نییە.

گوتی: لە خواردنەوەکە بخۆ.

گوتم: من ئەو جۆرە خواردنەوانە ناخۆمەوە.

زانیم نیازی خراپە، هەر بۆیە گوتم: من دەڕۆم، کاری دیکەت نییە؟

دەسی هێنا تەوقەم لەگەڵ بکات، کە دەسم برد بۆ تەوقە کردن، توند دەسی گوشیم، دەسم لە نێو دەسی ڕاپسکان و بە پەلە چوومە دەرەوە.

پاش چەن مانگێ لە کارکردن ، خوشکە گەورەکەم تێلێفۆنی کرد کە باوکم زۆر نەخۆشە و پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە، گەر فریای نەکەوی و برە پارەیەکی بۆ نەشتەرگەریەکەی نەنێریتەوە، ژیان لە دەستدەدا.نەمدەزانی چیبکەم و چۆن ئەو برە پارەیە دابینکەم، بە ناچاری بە ئەحمەدم گوت: دەزانی باوکم زۆر نەخۆشە؟!!

گوتی: چاک دەبێ ئینشەڵڵا.

گوتم: پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە، گەر بکرێ فریامان بکەوی، بڕێ پارەم بە قەرز بدەیتێ و لە مووچەکەم بیبڕی، تا بتوانین نەشتەرگەرییەکەی بۆ ئەنجامدەین.

زۆر بە ڕووخۆشییەوە گوتی: بە سەرچاو، بەڵام ئێستە کارم هەیە، دەڕۆم و شەو دێمەوە پارەکەت دەدەمێ.

هەر لە چاوەڕوانییدا بووم، ئاخۆ کەی دێتەوە و پارەکەی لێوەرگرم و بە زوویی بینێرمەوە. زۆر لە چاوەڕوانیی بووم، گوتم: لەوانەیە بە درۆ گوتبێتی شەوێ دێمەوە، بەڵام لە پڕێکدا هاتەوە، زۆر دڵم کرایەوە، بە ڕووخۆشییەوە چووم بەرەو پیرییەوە، هەر کە بینیمی گوتی: لە بیرم نەچووە، خەمت نەبێ.

چووە ژوورەکەی و داوای خواردن و خواردنەوەی کرد تا من بۆی بەرم،زۆر دەترسام بەڵام ناچار بووم، گوتم: چیی دەبێ با ببێ، تەنیا باوکم لە مردن ڕزگاربکەم.

کە چوومە ژوورەوە، گوتی: خۆتیش دانیشە با پێکەوە نان بخۆین.

گوتم: برسیم نییە، وازم لێبێنە.

گوتی: گەر دانەنیشی، ئەو برە پارەیەی داوات کردووە، ناتدەمێ.

گوتم: بە خودا برسیم نییە.

گوتی: گەر برسیتیش نەبێ، حەزدەکەم دابنیشی.

بە ئاسپایی دانیشتم، کەمێ لە خواردنەکەی خوارد و گوتی: پێکێکم بۆ تێکە. پەرداخەکەم بۆی پڕکرد، گوتی: بۆ خۆتیش تێبکە.

گوتم: من ناخۆمەوە.

گوتی: بۆ ناخۆیتەوە، دونیا هیچ نییە، هەر بە خۆشی و ڕابواردن بە سەریببە.

گوتم: تۆخۆت بخۆرەوە بەڵام من ناتوانم.

سوێندی خوارد گوتی: بە سەر باوکت دەبێ لەگەڵم بخۆیتەوە.

هەستام گوتم: من دەڕۆم، ناتوانم پتر بمێنمەوە چونکە هێشتا کاری نێو ئوتێلەکەم ماوە. بڕێ پارەی لە جانتاکەی بەردەسی دەرهێنا، ئێجگار زۆر بوو و گوتی: سبەینێ ئەم پارەیە بۆ باوکت بنێرەوە.

پارەکەم بینی زۆر گەشبوومەوە، چونکە چارەسەری باوکم تێدا دەبینی و گوتم: زۆر زۆر سوپاس.

گوتی: تەنیا سوپاس.

گوتم: ئەی تۆ چییتدەوێ ؟!!

گوتی: دەمەوێ یەك ماچێکم بدەیتێ.

گوتم: بێوەفا مەبە بەرانبەر ڕاسپاردەکەی باوکم،ئەی باوکم نەیگوت وەك کچی خۆت تەماشای بکە و لە چاوچنۆکان پارێزگاریی بکە، تۆش باوکمت دڵنیاکرد کە وەك کچی خۆت دەبم.

گوتی: من گەر بێوەفابم، ئەم بڕە پارەیە بۆ باوکت نانێرم.

گوتم: توخوا وازم لێبێنە، کەمێ ویژدانت بخەرە کار و بزانە من کچی هاوڕێیەکی کۆنی خۆتم.

گوتی: تۆ زۆر جوانیی، بە جوانییەکەت شێتت کردووم، گەر ئەم شەو لەگەڵمدا بی، چەند پارەت دەوێ پێتی دەدەم ، ئەم بڕە پارەیەی کە سبەینێش بۆ باوکتی دەنێرین بە قەرز ئەژماردەی ناکەم و هەموو دەکەمە قوربانی جوانیی تۆ.

گوتم: من کچم و شووم نەکردووە.

گوتی: سوێند بێ بە هەموو شتێکی ڕاستی،گەر ئەم شەو لەگەڵم بیت، ئەوە بە نهێنیی مارەت دەکەم و دەتکەم بە هاوسەری خۆم.

گوتم: ئەی ژن و منداڵەکانت؟!!

گوتی: گەر تۆ ڕازییبی، هیچ کێشەم نابێ چونکە کارەکەمان نهێنییە. هەستایە سەرپێ و هێدی هێدی لێمنزیکبووەوە، دەمویست ڕابکەم، بەڵام لەبەر پارەکە و لەبەر بەڵێندانی بە مارەکردنم، نەمدەتوانی بڕۆم. لە خەیاڵی خۆمدا گوتم: وا چاکە شووی پێبکەم، ببم بە خاوەنی باشترین سەروەت و سامان.

دەسی خستە سەرشانم، کەمێ دوورکەوتمەوە، بەڵام پەلاماریدام و وەك گورگی برسی کەوتە گیانم و کراسی لەبەرمدا نەهێشت ، ئەو شەوە کچێتی لێسەندم. زۆرگریام، ئەویش دەیگوت من لە سەر بەڵێنی خۆمم، دوو بەند پارەی پێدام گوتی: سبەینێ بە زوویی بۆ باوکتی بنێرە.

پارەکەم وەرگرت و چوومەوە بۆ ژووری تایبەتیی خۆم و هەر بۆ بەیانی زوو پارەکەم بۆ باوکم حەواڵە کرد.

گوتم: پاشان چۆن مارەی کردی؟.

گوتی: هەفتەیەکی پێچوو گوتم: کەی مارەم دەکەی؟

گوتی: ئەم شەو وەرە بۆ ژوورەکەم، تا قسەی لێبکەین.

دیسانەوە خواردن و خواردنەوەم بۆ برد، شەوێ چەن پێکێکی بە زۆر پێخواردمەوە،چەن (حەبێکی) دەخستە نێو پەرداخەکەمەوە دەیگوت با زۆر تێکت نەدا, پاشان دەسی بە ڕابواردن دەکرد، تا بەیانی لە ژوورەکەیدا بووم، بەیانیش هەموو کارمەندانی ئوتێلەکە زانیان شەوێ لەگەڵیدا بوومە، ئەوەی سەیری دەکردم، پیرۆزبایی لێدەکردم کە ئەو چاوچنۆکە بە جوانییەکەم ڕازییە، بۆیە دیڵێ شەو لای بم.

هەر کاتێ بمگوتایە کەی مارەم دەکەی، بیانوویەکی دەدۆزییەوە، بەڵام ڕۆژێکیان گوتی: مارەکردنی چیی، شێت بووی!!.

گوتم: من ئێستە ژنم و منداڵم لێتدەبێ، ئەوسا ناچار دەبم دادگات لێبگرم.

گوتی: خەمت نەبێ منداڵت نابێ،چونکە شەوانە کە ڕابواردنم لەگەڵ دەکردی، (حەبی مەنع)م پێداوی تا منداڵت نەبێ. ئینجا گوتی دەبێ مەمنون بیت ڕابواردنت لەگەڵ دەکەم،چونکە بێزم نایەت ڕابواردن لەگەڵ هەموو کەس بکەم.

لەو ڕۆژەوە ئەو چاوچنۆکە پێم فێربوو، کە بێزاریش بوو، ئینجا ئەو زەنگینانەی لە دەرەوەی وولات دەهاتن و هاوڕێی بوون، منی بۆ لایان دەنارد. بەم شێوەیە بووم بەو کەسەی کە ئێستا تۆ دەمبینی و حەز بە ڕابواردن دەکەم.

سەری داخست و دەگریا و دەیگوت(من بێتاوانم، بەڵام فێریانکردم).

گوتم: چەن ساڵە لێرە کاردەکەی؟

گوتی: وەك گوتم: دەبوایە بۆ یەك ساڵ کارم بکردایە، بەڵام بە هۆی ئەوەی قەرزێ زۆرم کردبوو بۆ نەشتەرگەریەکەی باوکم، بە ناچاری ئەمە سێیەم ساڵە لێرە دەمێنمەوە.

گوتم: بەڵێنی پێنەدای پارەی نەشتەرگەریەکەی باوکت بە قەرز نەژماردە نەکات.

گوتی: بەڵێن لای ئەم ناپاکانە نییە.

گوتم: ئێستە قەرزت لە سەر ماوە.

گوتی: دوومانگە قەرزم لە سەر نەماوە و پارەیێ باشم پێکەوەناوە.

گوتم: بۆ ناچیتەوە بۆ لوبنان و لەگەڵ خێزانتدا بژی، تا ئەوڕۆ تۆ تاوانبارنیت،بەڵام گەر لەمەولا لێرە بمێنی و ئەم کارانە بکەی، تاوانبار

دەبیت،چونکە تۆ ئێستە بە ئارەزووی خۆت کاردەکەی، بێئەوەی کەس لەبەر قەرز زۆرت لێبکات.

بیرێکی قووڵی کردەوە و گوتی: قسەی تۆیە، وا چاکە بڕۆمەوە و ئەم کارە جێبێڵم.

گوتم: هیوادارم بڕۆیتەوە و چییدی لێرە نەمێنی.

گوتی: بەڵێنبیٚ لە سبەینێوە، بەرەو لوبنان بچمەوە.

گوتم: سوپاستدەکەم کە بە قسەم دەکەی، هیوادارم بچییەوە باوەشی نیشتمان و خێزانەکەت، بەڵام ویستم ئەمشەو پرسیارێکت لێبکەم، بەسەرهاتەکەت پرسیار کردنەکەی دواخستم.

گوتی: داوای لێبوردندەکەم، سەرم ئێشانی بە بەسەرهاتی خێزانەکەمان هەرچیی پرسیارتیش هەیە بیڵیٚ، دەیکەمە سەرچاوانم.

گوتم: جگە لە (قاهیرە) کویێی دیکە (مەلها–تیاترۆخانە)ی زۆرە، بە تایبەت ئەو شوێنانەی کچی عێراقیی کاری تێدەکەن؟

کەمیٚ بیریکردەوە،گوتی:مەلها لە (ئەسکەندەرییە، مورسامەتروح، ئەسوان) زۆرە، زۆربەی کچانی وولاٚتانیش لەویٚ کاردەکەن.

گوتم: سوپاس، من تەنیا بۆ ئەو پرسیارە بانگم کردووی.

گوتی: منیش زۆر سوپاستدەکەم، ئێستە هەستدەکەم مرۆڤم، چونکە بڕیارمدا بچمەوە باوەشی نیشتمان وخێزانەکەم، سۆزی باوك و دایك و خوشکەکانم لە ئامێزدەگرم و بەم پارەیەش کاریٚ بۆ باوکم دەدۆزمەوە، سەر لە نویٚ ژیانی خێزانیمان بەختەوەردەکەینەوە. دەستیهێنا و تەوقەی لەگەڵ کردم و بە دڵخۆشییەوە چووە خوارەوە.

بەیانی خۆم ئامادەکرد و چوومە لای کارگێڕی ئوتێلەکە، (دونیا) لەوێبوو و داوای ئەوەی دەکرد، چ پارەی کارکردنی ماوە بیدەنیٚ، تا بۆ

لوبنـان بڕواتـەوە.زۆریـان لێـدەکرد نـابێ بـڕۆی، چـونکە تـۆ باشـترین کارمەندی ئوتێلەکەی. بەلاّم من پێمگوتن: ئەو ئارەزووی خۆیـەتی، کار ناکا و بۆ وولاّتی خۆی دەچێتەوە.

دونیا گـوتی: قـسەی ئـەم برایەمـە، چـونکە بـە ڕاسـتی برامـە و ڕێـی ڕاسـتی پیـشانداوم، پارەکـەم بـۆ هـەژماردە بکـەن و بمـدەنێ، بـا ئێـرە جێبێلّم.

پارەکەی ئەویان هـەژماردە کـرد و منـیش چییم مـابوو وەرمگرتـەوە. هەردووکمان بە جووتە چووینە دەرەوەی ئوتێلەکە.

فرمێسك لە چاوەکانی دەباری گـوتی: تـا مـردن سوپاسـی تـۆ دەکـەم، بەلاّم حەزمدەکرد ناو و ناونیشانت بزانم.

گوتم: ناوم (بڕیارە)، (کوردم)، خەلّکی کوردستانی عێراق.

گوتی: ناونیشانی تەواوم دەوێ.

گوتم: مـن و تـۆ یەکدی نابینینـەوە، لەبەر ئـەوە پێویـست ناکات، با درەنگت پێنەچێ، بگەرە فڕۆکەخانە.

تاکـسیەکی گـرت، دوو ماچـیکردم، سـەرکەوت و ڕۆیـشت تـا دوورکەوتەوە بە دەسی بای بای بۆ دەکردم.

منیش دوا سەرنجمدا و تاکسیم گرت بەرەو گەراجی ئەسوان.

(٩)

گەیشتمە گەراج، بە پاسێکی پترۆڵ نیسان بەرەو ئەسوان کەوتینە ڕێ، لە تەنیشت گەنجێکی قات لەبەر دانیشتبووم، لە پاش نیوکاژێر لە بێدەنگی،حەزمکرد قسەی لەگەڵ بکەم، گوتم: کەشوهەوای ئێرە لەگەڵ وولاتی ئێمە زۆر جیاوازیی هەیە.

گوتی: تۆخەڵکی کوێی؟

گوتم: عێراق.

زۆر بە ڕێزەوە خێرهاتنی لێکردم و گوتی: عێراقییم زۆرخۆشدەوێ، کاتی خۆی باوکم لە عێراق کاریدەکرد و بە هۆی کارکردنی باوکمەوە توانیم زانکۆ تەواوبکەم.

گوتم:جەنابت چییت تەواوکردووە؟

گوتی: من دەرچووی کۆلیژی یاسام ، وەك پارێزەرێ دامەزراوم و بە ئێوارانیش لە ئەسوان نوسینگەی تایبەتیی خۆم هەیە.

گوتم: خۆشحاڵم کە پارێزەری، منیش لە عێراق دەرچووی کۆلیژی (توێژەری کۆمەڵایەتییم)،لە فەرمانگەی بەشی مافی مرۆڤ کاردەکەم.

ئەویش خۆشحاڵی خۆی دەربڕی، چەن کاژێرێ لە بارەی باسکردنی ژیانی عێراق و میسر دواین. کە لە ئەسوان نزیکبووینەوە، گوتی: حەزدەکەم بۆ ماڵی ئێمە بچین و لە خزمەتدا بم.

گوتم: سوپاس، دەمەوێ بۆ ئوتێلێکی نایاب و باش بچم، بەڵام نازانم لێرە چ ئوتێلێ زۆرباش ونایابە؟

گوتی: ئوتێل (زەفاف)، لە سەر کەناری ڕووباری نیلە، شوێنێکی زۆر دڵگیرە.لە جانتا دیبلۆماسییەکەی کارتێکی دەرهێنا وگوتی: ئەم کارتە ناونیشانی نوسینگەکەمە،زۆرخۆشحاڵ دەبم سەردانیم بکەی.

زۆر سوپاسم کرد، گوتم: دڵنیابە سەردانیت دەکەم.

گەیشتینە گەراج و هەموو دابەزین، پارێزەرەکە تاکسیەکی بۆ گرتم و گوتی:ئەم هاوڕێیە بگەیەنە ئوتێل زەفاف.بە زۆریش کرێی تاکسییەکەی دام.

لە پێش دەرگای ئوتێلەکە دابەزیم، باخێکی فراوانی لە پێشدابوو، بە گوڵوگوڵزار ڕازابووەوە.چوومە نێو ئوتێلەکە، کچ و کوڕێ هاتنە پێشوازییم، جانتاکەیان لێوەرگرتم و کەوتنەپێشم بۆ لای کارگێڕی ئوتێلەکە. کارگێڕەکە کچێکی زۆر جوانبوو، خەڵکی وولاتی تونس بوو، بە ڕوویەکی خۆشەوە زۆر خێرهاتنی لێکردم، ناسنامەکەم دەرکرد و گوتم: ژوورێکی زۆر باشم بۆ دابینکە، کە( پاداشتێ زۆر باشم پێدا)، پاداشتەکەی وەرگرت و بە ڕوویەکی خۆشەوە گوتی: ژوورێکە و دەڕوانێتە سەر ڕووباری نیل.

گوتم: سوپاس، ئەم پارانەم لێوەربگرە، لە بەشی ڕاسپاردە بینووسە.

پارەکەی لێوەرگرتم، بینی زۆرە پتر ڕێزی لێگرتم، کلیلەکەی داینە دەس ئەو کچەی لە پێشوازییدا بوو،گوتی: بیگەیەنە ژوورەکەی خۆی و چیی ویست بۆی جێبەجێبکە.

ژوورەکە وەك هەمان ژووری ئوتێلەکەی قاهیرە بوو، بەڵام ئەمیان بەلەکۆنەی هەبوو، دەیڕوانییە سەر ڕووباری نیل کە بە هەوای فێنکیی و شەپۆلەکانی دڵی دەکردمەوە.پاش پشوودان، هەر وەك کاری ئاسایی،

**لـه نزیکـی نیوەشـەواندا بـۆ مـەلهاکان دەچـووم، چـونکە لـەو کاتـە زۆر قەرەباڵغ دەبوو، تەماشای هەموو ئەو کچانەم دەکرد لە مەلهاکە بوون.**

**پـاش چـەن شـەوێك وێڵیبـوون بـە دوای کـچانی ئـەنفال، لـە چـەندین مەلهای ئەو شارە، بێئومێد بووم کە ناتوانم بیاندۆزمەوە.**

**شـەوێکیان زۆر بێزاربووم،کـەمێ زووتـر چـوومە دەرەوەی ئوتێلەکـە، مەلهایێ هەبوو هەر لە دوورەوە لەبەر گڵۆپی سوور، سووری دەکردەوە، کـە زیـاتر نزیککەوتمـەوە (مـەلهای حـەمرێ ) نووسـرابوو، لـە دەرگاکـە چووومە ژوورەوە، هەرچاوم دەگێڕا، لە گۆشـەیەکی مەلهاکـە دانیـشتم و بوتڵێ بیرەم داواکرد و خۆم پێوەی خەریککردبوو، تەماشای هـەموو ئـەو کەسانەم دەکرد کە لە دەرگاکە دەهاتنە ژوورەوە.**

**کچێکی نزیك تەمەن ٢٥ ساڵ هاتە نزیکەوە،گوتی: مـن نـاوم (نورا)یـە دانیشم؟**

**گوتم:من پەلەمە ،گەر دادەنیشی تـەنیا یـەك بیرەم لەگەڵدا بخۆرەوە و ئەوسا من جێتدەهێڵم.**

**کە دانیشت،بانگی گەرسۆنەکەم کرد،داوای دوو بیرەم لێکرد، یەکیان بۆ ئەو، ئەوی دی بۆخۆم.**

**گوتی: تۆ بە میسریی ناچی، وانییە؟**

**گوتم: من عێراقییم، ئەی تۆ؟**

**گوتی من میسرییم، خەڵکی (ئەسوان)م.**

**گوتم: خۆشحاڵم.**

**گوتی:پەلەی چییتە،ئەمشەو حەزدەکەم پێکەوەبین و پاشـان لەگـەڵت دێمەوە.**

**گوتم: داوای لێبوردن دەکەم، کارم زۆرە.**

بەم باسانەوە بیرەکەی تەواوکرد، کە زانی پتر سوودم لێنابینێ هەستاوچوو بۆ لای کەسێکی دی.

بانگی گەرسۆنەکەم کرد گوتم: سێ بیرە چەن دەکا.

گوتی: پەلەی چییتە، خەڵکی وا تازە دێن.

گوتم: ڕاستە، بەڵام بێزارم و دەمەوێ بۆ ئوتێل بچمەوە.

گوتی: لە چ ئوتێلێکی؟

گوتم: لە ئوتێل (زەفاف)، لە سەر ڕووباری نیل.

گوتی لەو شوێنە خۆشە بێزاریی،گەر ئارەزوو بکەی کچێکی جوانت لەگەڵ دەنێرم بێزاریی و ناخۆشییت لە بیرباتەوە.

هەناسەیەکم هەڵکێشا،بێهیواییم پیشاندەدا.ئەویش گوتی: دەزانم نامۆیی زۆر ناخۆشە، بەڵام بەم ڕابواردنانە لە بیرخۆتی بەرەوە.

گوتم:کچی زۆر جوانتان هەیە؟

گوتی: مەلهاکەی ئێمە بە ناوبانگە، کچی (ڕۆمانیی، لوبنانیی، سوریی، تونسیی، ئیتاڵیی، عێراقیی، فەرەنسیی و زۆری دیکەمان هەیە.

گوتم: من عێراقییم، کچی عێراقییم دەوێ.

گوتی: بە سەرچاو، بەڵام حەز بە چ جۆرە جوانێ دەکەی؟

بیرمکردەوە وەسفی جوانیی خوشکەکەم بکەم،لە کاتی ئەنفالکردنیدا تەمەنی شازدە ساڵ بوو،هەر بۆیە گوتم: تەمەنی سی ساڵ بە سەرەوە بێ،(چاو ڕەش ،باڵا بەرز ،سوور و سپی بێ)،ئەم داواکارییەم، دەروونی ئاڵۆزانم و تەزووییێکی بە سەراپای جەستەمدا تێپەڕان.

ناونیشانیی لێوەرگرتم، گوتی: یەك کاژێری دیکە دەگاتە ژوورەکەت.

چووومە دەرەوەی مەلهاکە ،هێندی هێندی دەڕۆیشتم، بیرم زۆر ئالۆزبوو، دەمگوت: دەبێ لە پڕێکدا خوشکەکەم بێتە ژوورەکەم و ئەمشەو بە یەکدی شادبینەوە.کە سەیری کاژێرەکەم کرد، نیوکاژێری بەم خەیالانەوە ڕێگەم بڕیبوو، لە پڕ پەلەکردنێ لە دەروونمدا دروسبوو، دەمویست زوو بگەمەوە ئوتێلەکە،نەوەکوخوشکەکەم لە چاوەڕوانیی بێ،نەمتوانی بە ڕێدا بڕۆم،یەکسەر تاکسیم گرت تا بە زووترین کات بمگەیەنێتە ئوتێلەکە.

بە پەلە لە تاکسیەکە دابەزیم و چوومە ئوتێلەکەوە، هەرچاوم دەگێڕا ئاخۆ دەبێ خوشکەکەم نەهاتبێ و لە هۆڵەکە چاوەڕوانییم بکا، بە کارگێڕیی ئوتێلەکەم گوت: هیچ کەس پرسیاری نەکردووم؟

گوتی: نەخێر.

گوتم:بۆ ژوورەکەم دەچم، هەرکەسێ پرسیاریکردم، تێلێفۆنم بۆ بکە.

لە ژوورەکەم،لە هۆڵە بچووکەکەی ژوورەکەم،لە سەر قەنەفەکە دانیشتبووم،جگەرەیەکم داگیرسان، مژێکم لە جگەرەکەمدا و دەمویست بیربکەمەوە چۆن پێشوازیی لە خوشکەکەم بکەم.زەنگی تێلێفۆنەکە لێیدا،بە پەلە بە دەسە لەرزۆکەکەم هەڵمگرت، لە کارگێڕەوە بوو گوتی: کچێ ناوی (ئەمەل)ە،عێراقییە،ژمارەی ژووری تۆی لایە،بێتە سەرەوە؟

گوتم: هەر بە پەلە با بێ.

تێلێفۆنەکەم داخست و بە نێوژوورەکەدا دەخولامەوە، هەستونەستم لای دەنگی لێدانی دەرگاکە بوو.چوومە نزیك دەرگاکە،لەو کاتەی لە دەرگایدا، یەکسەر کردمەوە، بە کچی لای خۆمان دەچوو،بەلام خوشکەکەم نەبوو.ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام سەرپۆشەکەی بوو،

زۆریـش بـه شـەرمەوە هاتـه ژوورەوە، فـەرمووی دانیـشتنم لێکـرد، لـه بەرانبەرم و له سەر قەنەفەکە دانیشت.

گوتم: به خێربێی، دەتوانم بپرسم ناوت چییه و خەڵکی کوێی؟

گوتی: ناوم (ئەمەل)ه و خەڵکی عێراقم.

گوتم: منیش خەڵکی عێراقم.

گوتی:دەزانم، چونکه عێراقی نەبوویتایه نەدەهاتم.

گوتم: بۆ به ئارەزووی خۆته، یا به ویستی خاوەن مەلهاکەیه؟

گوتی: من و چەن کچێکی دی هاوڕێم، هەمیشه دژایەتی ئەم کارانـه دەکـەین وبـه قـسەی خـاوەن مەلهەکـه ناکـەین، هەربۆیـه تـەنیا لـه چێشتخانەی مەلهەکه ،خواردن و مەزەیان بۆ دروسدەکەین.

ئەم وەڵامەی زۆرتر سەرنجی ڕاکێشام،دەمزانی لەو وەڵامـه گرنگانەیـه ماوەیەکه له چاوەڕوانییدا بووم.

گوتم:له کوێی عێراق دەژیت؟

گوتی:له باکووری عێراق.

گوتم:له چ شارێکی باکووری عێراق؟

بـه شـەرمەوە،ڕەنگی سـووربوەوە وگـوتی: بـۆ پرسـیاری شـوێنەکەم دەکەی؟!!.

گوتم: چونکه منیش خەڵکی عێراقم.

گوتی:من و هاوڕێکانم دانیشتووی کوردستانی عێراقین.

گوتم:دەزانی زۆر به باشی زمانی عارەبی میسریی فێربووی.

گوتی:شازده حەڤده ساڵێکه لەم ولآتەین،چۆن فێرنابین.

دڵنیـابووم کـوزده،زۆر بـەزەییم پێـدەهات، تەماشـای نێـو چـاوەکانیم دەکرد ئاخۆ دەبێ خوشکه گەورەکەم نەبێ و شێوەی گۆڕابێ، بـەڵام ئـەو

سەری داخست،منیش پەلاماری هەردوو دەسیمدا،سەرم بۆی دانوان ، دەسیم توند گوشی.

گوتی: با دوو پێك بخۆینەوە ،پاشان چیی دەڵێی وا دەکەین.

چەن جارێ ئەم قسەیەی گوتەوە،بەلاّم من دەسەکانیم توندتر دەگوشی،دەسێکی بە توندیی لە نێو دەسم ڕاپسکان،گوتی: جارێ وازم لێبێنە با دوو پێك ئامادەبکەم.

لە سەرەتاوە زۆر بە هێمنی دەگریام و فرمێسکم ئەهاتە خوارێ،کە چاوم هەڵبڕی و چاوەکانی بینیم گوتی:تۆ بۆ دەگریی؟.

دام لە کوڵپەی گریان،دەسم لە دەسیکردەوە، دەسەکانم دەلەرزین، نێوچەوانیم ماچکرد،بە زمانی کوردیی گوتم: ئێستە تۆ خەڵکی کوردستانی؟!!.

حەپەسا و ڕەنگی بە چەندین شێوە گۆڕا، گوتی: توخوا تۆ کوردیی؟!!.

گوتم: بەڵێ کوردم ، ناوم (بڕیارە) و خەڵکی کوردستانم.

سەری سوڕمابوو، گوتی: نازانم ئەمە ڕاستییە یا خەونە، پاش چەندین ساڵ کوڕە کوردێ لەم شوێنە دەبینم،بڕوا ناکەم کاکە گیان بڕوا ناکەم!!.

گوتم: چۆن ئێوە گەیشتنە ئێرە؟

گوتی:کاکە گیان گەر تۆ خەڵکی عێراق بی و کوردبی،باش دەزانی سەدامی خوێنڕێژ،چیی بە سەر کوردستان هێنا،چۆن گوندەکانی ڕوخاندین و پاشان بە ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە، کچان و کوڕانی گەنجەوە،بە ناوی شالاّویی کارەساتی ئەنفالەوە بەندی کردین و ئێمەی کچانیشی بەم وولاّتە عارەبانە فرۆشت.

گـوتم: خوشـكه گيـان منـيش خـه‌ڵكی گونـده‌كانی كوردسـتانم و دوو خوشك و باوك و زۆربه‌ی كه‌سه‌كانم ئه‌نفالن،من له‌ پێناو ئێوه‌دا، زۆر به‌ نهێنی بۆ میسر هاتووم،چونكه‌ زانیومانه‌ كچانمان فرۆشراون بـه‌ میـسر و له‌ مه‌لهاكان كارده‌كه‌ن،به‌ هۆی ئێوه‌وه‌ حكومه‌تی هه‌رێمی كوردسـتان، پاره‌یه‌كی زۆری بۆ تـه‌رخانكردووم، تـا بتاندۆزمه‌وه‌ و له‌گـه‌ڵ خۆمـدا بـه‌ نهێنی بتانگه‌یه‌نمه‌وه‌ كوردستان.

په‌لاماری ده‌سیدام ماچی بكات، به‌ڵام نه‌مهێشت.

گوتی:لـه‌ مێـژه‌ ئێمـه‌ حه‌زده‌كـه‌ین هـه‌واڵی عێـراق بـزانین، تـه‌نیا ڕۆژێ بیستمان سه‌دام ڕووخاوه‌ به‌ڵام نه‌مانزانی چیی بـه‌ سـه‌ر عێـراق هـاتووه‌، ئه‌وڕۆكه‌ خاوه‌ن مه‌لهاكه‌ بۆ چێشتخانه‌كه‌ هات،گوتی: كوڕێكی عێراقیـی ده‌یـه‌وێ ئه‌مـشه‌و له‌گـه‌ڵ كـچێكی عێراقییـا بـێ ،ده‌پاڕایـه‌وه‌ و ده‌یگـوت ته‌نیا ئه‌مجاره‌ به‌ قسه‌م بكه‌ن.

منـیش بـه‌ ده‌سـته‌ خوشـكه‌كانم گـوت: مـن ده‌چـم، بـا هـه‌واڵی عێـراق بزانین، هه‌ر بۆیه‌ به‌ خاوه‌ن ئوتێله‌كه‌م گوت،من ئاماده‌م بۆ لای ئـه‌و كوڕه‌ عێراقییـه‌ بـچم. ئـه‌ویش زۆر خۆشـحاڵبوو كـه‌ بـۆ یه‌كـه‌م جـاره‌ ڕازیـی ده‌بین.كه‌ منیش بۆ لای تۆ هاتووم ،ته‌نیا بـۆ وه‌رگـرتنی هـه‌واڵی عێراقـه‌، به‌ڵام نه‌مده‌زانی خۆشترین هـه‌واڵم ده‌سـده‌كه‌وێ، نه‌مـده‌زانی كوردسـتان ئـازاده‌ و حكومـه‌تی كـوردیی دروسبووه‌،باشـبوو بـه‌ زوویـی خۆمـان بـه‌ یه‌كدی ناسان، چونكه‌ نیازم باش نه‌بوو.

گوتم: بۆچیی؟.

جانتاكه‌ی هێنایه‌ پێشه‌وه‌ و شوشه‌یێ ده‌رمانی لێده‌رهێنا،گوتی: ئه‌م شوشـه‌یه‌ (ژه‌هـره‌)،هـه‌ر بۆیـه‌ ده‌مگـوت پـێش ڕابـواردن بـا دوو پێـك

بخۆینەوە،چونکە بە نیازبووم بیکەمە پێکەکەتەوە و ژەهر خواردت بکەم و بتکوژم.

گوتم:بە ڕاستی ئێوە جێی شانازیمانن،کە هەمیشە ویستووتانە ئابڕووتان بپارێزن.

گوتی: ئێمە بەرەنگاری درندێتیی جەللادەکانی ڕژێممانکرد، گەرچیی زۆر ئازاریاندان،ئابڕووی هێندێکیان تکاندین،کچێتییان لێسەندین بەڵام ئێمەش "هێزێکمان دروسکرد بە ناوی (هێزی گیانیی تۆڵەی کچان)" بەو هێزە توانیمان دوو کەس لە جەللادەکان بکوژین.

ئەو هەواڵە خۆشە، سەری سوڕهێنام، گوتم: بە ڕاستی ئێوە قارەمان بوونە، چۆن توانیتان؟!!.

گوتی:ئەو قارەمانێتییە دەگەڕێنمەوە بۆ کچێ ناوی (نەسرین) بوو.

گوتم:دەمەوێ باسی بەندێتیی خۆتان بکەی،چۆنیش ئێوەی کچان توانیتان دوو جەللاد بکوژن؟

گوتی: "چوارسەد کچ دەبووین،بە زۆر لە دایك و باوك و براكانیان جیاکردینەوە و لە هۆڵێکی بچووك بەندیان کردین،لە نیوەشەودا چوار لە جەللادەکان دەهاتن بە ئارەزووی خۆیان، پێنجیان لێهەڵدەبژاردین بۆ ڕابواردنی شەویان،هەر بە لێدان و قژ ڕاکێشان دەیانبردین، شەوێ لەو شەوانە، (نەسرین)ی قارەمان، یەکێ بوو لەو پێنج کچە، کە لە بەرەبەیان گەڕاندیاننەوە، زۆری پێناخۆشبوو بە زۆر کچێتیان لە دەسدابوو، بیرۆکەی تۆڵەی کردە مێشکمانەوە و دەیگوت ئێمە چوارسەد کەسین،ئەو درندانەی شەوانە دێن و لێمان هەڵدەبژێرن، چوار کەسن، بۆچیی بەرەنگاریان نەبینەوە و ئەمجارەیان کە هاتنەوە بیانکوژین.لە سەرەتاوە هێندێ کەس ڕازیی نەبوون،بەڵام کە دیسانەوە هاتن و

پێنجــی دیــان لێهەڵبــژاردین و بەرەبــەیان گەڕاندیاننــەوە، ئــەوانیش پاڵپشتی بیرۆکەکەی (نەسرین)یان کرد. ئەو (نەسرین)ە هێند بە توانا بوو،تــوانی گیــانی تۆڵــە لــە مێــشکی هــەمووان دروســبکات و هێــزیّ دابمەزرێنیّ بە ناوی (هێزی گیانیی تۆڵەی کچان). چوار تیپی دامەزراند تا هەر تیپیّ بتوانیّ جەللادیّ لە ناو بەریّ.پیلانێکی دانا بۆ کاتی هاتنیان،هەموو لە چاوەڕوانیی کاتی هاتنی دڕندەکانی شەو بووین، بەڵام ئەمجارەیان پێچەوانەی جارانی دی بووین، هەمووان بە عیشقەوە بەرەو پیری مەرگ دەچووین و پیرۆزیی ووشەی شەهید و گەیشتن بە کاروانی شەهیدان، لە ناوبردنی دڕندە و داوێنپیسان،تۆمارکردنی چالاکییەکی بێوێنە بۆ هێزەکەمان، پیرۆزترین دروشمی ئێمەی کچان بوو. لە نیوەشەو جەللادەکان هاتنە ژوورەوە، ویستیان دیسانەوە لێمانهەڵبژێرن، هەمووان بە جاریّ شاڵاومان بۆ بردن، دوانیان کوژران و دووانەکەی دی ڕایانکرد،پاشان کۆمەڵیّ چەکدار هاتن و شەڕێکی بێوێنەمان لەگەڵیان ئەنجامدا،پازدەیان لێشەهیدکردین،پاش چەن ڕۆژیّ دووان لە بریندارەکانیش شەهیدبوون، ئیدی دوای ئەو شەڕە جەللادەکان نەیاندەوێرا شەوانە بێنەوە".

لە پاش چەن ڕۆژیّ لیژنەییّ هات ، گوتی: ئێوەی کچان ئازادەکرێن، لە سەرەتاوە حەفتا کچیان لێهەڵبژاردین،لەو حەفتا کچە، (نەسرین)ی پاڵەوانیی هێزەکەمانی تێدابوو. لە پاش ئەوان(٢٨)ی دیکەیان هەڵبژارد، لەو بیستوهەشتە ئێمەیشی تێدابووین، سواری فڕۆکەیان کردین و گەیشتینە میسر. ئینجا زانیمان فرۆشراوین.

ئەو شەڕەمان دژ بە جەللادەکان، توانای هێز و تۆڵەی پتەوکردین. هەر بۆیە لەم غوربەتییەش کەس نەیتوانی بە سەرماندا زاڵبیّ، هەمیشە

بـه یەکـدیمان دەگـوت (ئێمـە بـەو بێهێزیـی و برسـێتیی و دڕنـدێتیی جەللادەکانـەوە) توانیمـان چـاویان بـشکێنین، ئـەی دژ بـەم ترسـنۆك و داوێنپیسانە ناتوانین هیچ بکەین.

گـوتم:بـە ڕاسـتی ئێـوە شـایانی هـەموو شـتێکن، پێویـستە ئێـوە لـە بەرزترین لووتکەی کوردستان پەیکـەرتان بۆ بکرێ،بەڵام پێمبڵـێ، ئێوە چەن کەسن لەو مەلهایەدا کاردەکەن؟

گوتی:لەو بیستوهەشت کەسە،دە کەسمان بۆ ئێرە هاتین، هەژدەکـەی دی بۆ شوێنی دیکەیان بردن،بەڵام تا ئەوڕۆ هەواڵیان نازانین.

لـە سـەرەتاوە ویـستیان وەك کـچانی دیکـەی مەلهاکـە هـەر جـارەی بـە دەس داوێنپیسێکەوەبین، بەڵام هەر یەکەم شەو، بەرەنگاریان بووینـەوە و سـەری دوان لـەو داوێـن پیـسانەمان شـکاند کـاتێ کـە بـە سەرخۆشـی دەهاتن و دەیانویست دەسوازیی و کاری خراپمان لەگەڵدا بکەن.

خـاوەن مەلهاکـە زۆر ترسـا،گوتی: بەپارەیـەکی ئێجگـار زۆر ئێـوەم کڕیـووە، پێویـستە ڕوویـەکی خـۆش بدەنـە ئـەو کەسـانەی ڕوو لـە مەلهاکـەمان دەکەن،ئـەگینا مەلهاکـەمان تێکدەچـێ و کـەس ڕوومـان تێناکا.

تێمانگەیانـدن زمـانی عـارەبیی نـازانین و ڕێنـادەین هـیچ کـەس دەسـدرێژییمان بـۆ بکـات، گـەرنا ئـەوا لـەم شـەڕەش ترسـناکتر دەبینی. ناچاربوو دوورمان بکاتـەوە لـە نێـو مەلهاکـە ،لـە چێشتخانەی مەلهاکـە تەنیا خواردن و مەزەیان پێ ئامادە دەکردین.جاروبار دەهات و قسەی خۆشـی بـۆ دەکـردین ودەیویـست وا بکـات حـەز بـە تێکـەڵبوونی داوێنپیسانی مەلهاکەمان بکات،بەڵام هەوڵەکەی بێسوودبوو.

شـەوێکیان سەرخۆشـێکی بـۆ ژووری (فەهیمـە و فاتیمـە) نـارد،دوو خوشك بوون لـەو ژوورەدا دەنووسـتن،زۆریش جوانبـوون.کە گوێمـان لـە هەرا و هوریا بوو، من و (نورا) کە لە ژووری تایبـەتیی خۆمـان بووین،بـە پەلـــە چـــووین بـــۆ ژووری (فاتیمـــە و فەهیمـــە)،چـــووینە ژوورەوە،سەرخۆشەکە کەوتبوو، هەر بـە بوتڵـە بیرەکـەی دەس خـۆی، لـە چـەن لایەکـەوە سـەریان تەقانـدبوو، کـە لێـی ووردبوومـەوە، وەك ئـەو جەللادە هاتە پێش چاو کە لە نێو ڕژێم کوشتوبوومان.یەکسەر فاتیمـە پێیگوتین: ویستی ئابڕومانبـەرێ ، ئێمەش پـەلامارمان دا و بوتڵکەمان لە دەسی سەند و هەر بەو بوتڵە کوشتمان.

گوتم: دەستان خۆشبێ، هەر ئێستا بە نهێنی فرێی دەدەینە رووباری (نیل)ەوە و ژوورەکەش پاکدەکەینـەوە تـا کـەس هەست نەکات،بـەڵام لـە پڕێکدا گوێمان لە خاوەن مەلهاکە و چەن کەسێکی دیکە بوو، زۆر بە پەلە بەرەو ژوورەکانمان دەهاتن،ڕامانکردە ژوورەکەی ئێمە و هەستمان لێڕاگـرتن، گوێمـان لێبـوو دەیگـوت، هـەر ئێـستا پـۆلیس بانگدەکـەم. (فاتیمـە و فەهیمـە) گوتیـان، ئێمـە بـا ڕابکـەین، گـەر خۆمـان خـستبێتە ڕووباری نیلەوە،خۆمان بە دەسەوە نادەین، هەردووکیان ڕۆیشتن، بـەڵام ئەوەی جێـی داخە،لـە پـاش یـەك هەفتـە تـەرمی هـەردووکیان لـە کەناری رووبـاری نیـل دۆزرایـەوە، ئێمـەش لـە گۆڕسـتانی غـەریبان لـە ئەسـوان ناشتمانن. ئیدی لـەو شـەوەوە، هـیچ کـەس نەیـدەوێرا نزیکمـان بکـەوێ، تەنیا کاری چێشتخانەمان دەکرد.

سـەرم لـە قارەمـانێتیی کـچانمان سـوڕمابوو،هەر یـەکێکیان خـانزادێ بوون، گوتم:گەر ئەو جووتە خوشکە ناویان (فاتیمە و فەهیمـە) نەبوایـە، دەمگوت خوشکەکانی منن.

گـوتی: نـاوی کوردییـان گۆڕیـوین،من نـاوم شـیلان بـوو، کردیـان بـه (ئەمەل).

ئەی خوشکەکانی تۆ ناویان چیی بوو، شێوەیان چۆن بوو؟.

گوتم: ناویان (ئالاّ و کوردستان) بوو، کەمێ شێوەیان بە تۆ دەچوو.

گـوتی: نـاتوانم بڵێم خوشـکەکانی تـۆن، چـونکە ئـەم باسـکردنە وا بـۆ پـازدە سـاڵ دەچێ و ناویـانم لـە بیر نەماوە،بـەڵام وا بـزانم لـەو نـاوانەوە دوورنین،شێوەشیان پێمدەچوو، چونکە ئێمە لـە هـەرە جوانـەکان بووین بۆیە هەڵیانبژاردووین بۆ ئەم شوێنە.

دڵنیاییێ لە دەروونمدا دروسبوو کە ئەو دووانە خوشکی منن،زۆریش ئەو وەڵامەم پێخۆشبوو، پتریش، کە خوشـکەکانم لـە پێنـاو ئابڕوویـان ، داوێنپیسێکیان کوشتووە،جگە لەوەش ئەندامبوونە لە خەباتی (هێـزی گیانیی تۆڵەی کچان). گوتم: وا بێ خوشکە (شیلان)، بە خۆتەوە هەشت کەستان لە مەلهاکە ماون.

گوتی: نەخێر، یەکێ دیکەمان بە نەخۆشی شێرپەنجەی مێشك گیانی سپارد ،ئەویشمان لە تەنیشت (فاتیمە و فەهیمە) ناشت.

گـوتم: کەواتـە دەبـێ هـەر (حـەوت)تـان لەگـەڵ خـۆم بەرمـەوە، پاشـان ماوەیەکی دی دێمەوە، (هەژدە) کچەکەی دیکە دەدۆزمەوە.

گوتی: کاکە گیان، تۆ بە ڕاستە ئێمە دەبەیتەوە کوردستان؟!!.

گـوتم: بـەڵی بـە ڕاسـتمە ،بـەڵام دەبـێ ئـەم کـارە زۆر بـە نهێنیـی ئەنجامدەم، ئێوەش دەبێ ئاگادارین و باسی نەکەن، هەوڵدەدەم هـەر لە سـبەینێوە ڕێیـەك بدۆزمـەوە کـە چـۆن بتـوانم بـە نهێنیـی لـە میـسرەوە بتانگەڕێنمەوە بۆ کوردستان.

**له خۆشیاندا دەگریا،بە لچکی لەچکەکەی ویستی چاوەکانی بسڕیّ، کلێنسم بۆی هێنا تا چاوی پێبسڕیّ ، وەری نەگرت و گوتی: (کاکە) حەزدەکەم هەر بەم لەچکە چاوم بسڕم،دیاری باوکمە و زۆر لام پیرۆزە.چاوەکانی سڕی و گوتی: کاکە گیان، من لە خۆشییان دەگریم، لە خۆشی ئەوەی دەچمەوە باوەشی نیشتمان، دەچمەوە گوندەکەمان، بەڵام کاکە گیان چۆن دەتوانی بمانگەڕێنیتەوە؟!!.**

**گوتم: (پارێزەریّ) لە ئەسوان بووەتە هاوڕێم، کوڕێکی زۆر زیرەکە، ناونیشانی نوسینگەکەی پێدام سەردانی بکەم، سبەینیّ بۆ نوسینگەکەی دەچم و داوای ڕێگە چارەیەکی لێدەکەم.**

**گوتی: حەزدەکەم بە زوویی بەیانی بێت تا ئەم هەواڵە بگەیەنمە دەستەخوشکەکانم، چونکە زۆر لە مێژە چاوەڕوانیی هەواڵێکین یا بینینی کوردیّ بە زمانی کوردیی لەگەڵماندا بدویّ،دەسەکانی ڕوو لە ئاسمان هەڵبڕی و دایکم ئاسا نزای بۆ دەکردم و دەپاڕایەوە خوا سەرکەوتووم بکات لە ئەنجامدانی ئەم کارە پیرۆزە.**

**تەماشای کاژێرەکەم کرد لە سێی شەو تێپەڕی بوو،گوتم: زۆر نەماوە بۆ بەیانی،با کەمیّ بنووین. ئەو لە سەر قەرەوێڵەکە و منیش لە سەر قەنەفەکە نووستین.وا هەستمدەکرد ئەو شەوە خوشکم میوانمە.**

**بەیانی لە کاژێر(٧) بە ئاگاهاتین، نە من بڕوام دەکرد کچە ئەنفالێك لە ژوورەکەمدایە، نە ئەویش بڕوای دەکرد لە ژووری کوڕە کوردیّ زۆر بە ئارامیی و بێترس نووستووە.**

**تەماشایم کرد و گوتم: پێشنەوەی بچینە خوارەوە، پارەییّ باشت دەدەمیّ بیدەرە دەست خاوەن مەلهاکە،پێیشی بڵیّ تا ئەم کوڕە عێراقییە لێرە بێت، شەوانە بۆ لای دەچم و پارەت بۆ دێنمەوە، بەم فێڵە**

**دەتـوانین یەکـدی ببیـنین، بـەڵام نـابێ هەسـت بکـات، دەبـێ هـەمووان نهێنیی بپارێزین.**

**لە پاش نانخواردنی بەیانی، (شیلان)م بە تاکسی گەیاندەوە مەلهاکە، بـە هـۆی ئـەو کارتـەی پارێزەرەکـە پێیـدابووم و ژمارەکـەیم وەرگـرت، پێوەندییم پێوەکرد،ئەویش زۆر خۆشحاڵبوو و کاژێری (٣) ی ئێواریێ لە نوسینگەکەی خۆی دیاریکرد تا یەکدی ببینین.**

## (١٠)

لـه كـاژێری سـێ گەیـشتمە نوسـینگەكە ، یەكـسەر ناسـیمییەوە و گوتی: تۆ چەن ڕۆژە بۆ دیارنیت؟

گوتم: هێندێ كاری تایبەت خەریكی كردبووم .

زەنگـی لێـدا و سـكرتێرەكەی هاتـە ژوورەوە، پێیگـوت: ئـەم برایـە میوانێ خۆشەویستە و لە عێراقەوە هاتووە، بزانە چیی دەخواتەوە.

ئەویش زۆر خێرهاتنی لێكردم، گوتی:چیی دەفەرمووی؟

گوتم: گەر هەیە، نیسكافە.

گوتی: بە سەرچاوان. پارێزەرەكەش گوتی: بۆ منیش نیسكافە.

پاش خواردنەوەی نیسكافە و باسكردنی زۆر شتی لاوەكی.گوتم: بۆ كارێكی زۆر نهێنیی و تایبـەتیی بۆ لای جەنابت هـاتووم، چونكە لێرە كـەس ناناسـم، تـەنیا تـۆ نـەبێ، جـا دەمـەوێ هاوكـارییم بكـەی و جێـی متمانەمان بی.

گوتی: دڵنیابە، چیی هەیە لە دڵتدا مەیهێڵە.

گوتم: دەركردنی پاسەپۆرتە.

گوتی: زۆر ئاسانە، نهێنیی بۆ چییە؟.

گوتم: بۆ چەن كچێكی عێراقییە و پاسەپۆرتیان نییە.

گوتی: ئەی چۆن گەیشتوونەتە میسر؟

گوتم: بە نهێنیی و قاچاغ هاتوون.

بیریکردەوە، گوتی: چەن کەس دەبن؟

گوتم: حەوت.

گوتی: پارەیەکی زۆری دەوێ.

گوتم:گرنگ ئەوەیە پاسپۆرتمان بۆ دەرهێنی تا بێگرفت بگەڕێینەوە، جا چەن پارەی دەوێ هیچ کێشە نییە و دەیکەمە سەر چاوانم.

گوتی: دەبێ ناسنامەی حەوت کچە میسریی پەیدابکەم، کە هاوتەمەن بن لەگەڵ ئەو کچانە،پاشان وێنەی ئەو کچانەش لە ناسنامەکان بدەم، ئەوسا دەتوانم پاسەپۆرتیان بۆ دەربێنم.

گوتم: چەن پارەی دەوێ؟

کەمێ بیریکردەوە گوتی: هەر کچێ (٥٠٠) پێنج سەد دۆلاری دەوێ.

گوتم: بە ڤیزا و پسولەی فڕۆکەوە.

پێکەنی و گوتی:نەخێر، تەنیا بۆ دەرکردنی پاسەپۆرتەکەیان، ئەوەش کارێکی زۆرگرانە و مەترسیداریشە.

نەمویست پارەکەی پێکەمکەمەوە، چونکە ئەو پارەیە لای ئەوان زۆر بوو، بەلاّم لای خۆمان وا نەبوو، بۆیە گوتم: من ڕازییم، بەلاّم دەمەوێ هەر خۆت ڤیزا و پسولەی فڕۆکەشمان بۆ تەواو بکەی.

گوتی:ئاسانە،ئەویان تەنیا پارەی ڤیزا و پسولەکەتان لێوەردەگرم، جگە لەمانەش،بۆ ئەوەی متمانەی تەواوم پێبکەی، تا سواری فڕۆکەش دەبن هەر لە چاودێرییتان دەبم.

گوتم: زۆر سوپاس، بەلاّم ئێستە من چیی بکەم؟

گوتی: تەمەنی کچەکان،وێنەی تایبەت بۆ پاسەپۆرت و ناسنامەکان، لەگەڵ نیوەی بڕیی پارەی تێچوون،لە پاش وەرگرتنی پاسپۆرت و ناسنامەکان نیوەکەی دیکەم بۆ بێنە.

**گوتم: سبەینیٚ ئەم کاتە سەر دەدەمەوە و داواکارییەکەت جێبەجیٚ دەکەم، بەڵام هیوادارم زۆر نهێنیی بیٚ.**

**گوتی: من لە تۆ پتر حەزدەکەم نهێنیی بیٚ.**

**ماڵاوابوونم لێکرد و چووم بەرەو ئوتێلەکە، یەکسەر پێوەندییم بە خاوەن مەلهاکەوە کرد گوتم: دەتوانی ئەمشەو (ئەمەل)م بۆ بنێری، چونکە دوێنیٚ شەو،خۆشترین شەوم بوو.**

**گوتی: بێخەمبە، پاش دە خولەکیٚ وەڵامت دەدەمەوە.**

**چوومەوە ژوورەکەی خۆم،زەنگی تێلێفۆن لێدرا، کارگێڕیی ئوتێلەکە گوتی:(مەلهای حەمرا) لەگەڵتایە،خاوەن مەلهاکە بوو،زۆر بە خۆشییەوە گوتی:جگە لە (ئەمەل)، کچیٚ دیکەش دەیەویٚ بۆ لات بیٚ، ئەویش عێراقییە و هاوڕێی (ئەمەل)ە.**

**گوتم: زۆرچاکە، با ئەویش ئەمشەو بیٚ.**

**لە خۆشییان گوتی: هەر ئێستە و بە زووترین کات خۆم دەیانهێنم.**

**گوتم:منیش سبەینیٚ دوو هێندەی پارەکەی ئەوڕۆت بە (ئەمەل)دا بۆ دەنێرم.**

**گوتی: هەرئێستە بە ئۆتۆمبیلەکەم دەیانگەیەنمە لای جەنابت.**

**گوتم: سوپاس، منیش وا لە چاوەڕوانییم.**

**چوومە بە لەکۆنەکە و تەماشای ڕووباری (نیل)م دەکرد، هەردوو خوشکەکەم، فریشتە ئاسا دەسیان لە نێو دەسی یەکدیابوو، لە کەناری ڕووباری (نیل) تەماشایاندەکردم،ببوونە پەری دەریا،زەردەخەنە پاکوبێگەردەکەی منداڵیان بۆ دەنواندم،جاروبار پڕیشکی شەپۆلی ڕووبارەکە، کراسە سپییە ئاوریشمییەکەیانی تەڕدەکرد، ئەوانیش چەن هەنگاویٚ دەهاتنە پێشەوە،پتر هەنگاویان دەنا،تا وەك دوو باڵندە**

هەڵفڕین،بەرەو ڕووم دەهاتن و زەردەخەنەیان بۆ دەکردم و دەیانگوت: کاکە (بڕیار)،لە مێژ بوو لە چاوەڕوانیی بووین، تا بمانگەیەنیتەوە کوردستان،وەکو جاران لە گوندەکەمان پێکەوە ژیان بە سەر بەرین، هێدی هێدی هاتنە پێشەوە ، ئامێزم بۆ کردنەوە تا چەند ماچێکی خۆشەویستییان لەگەڵ بگۆڕمەوە، لێدانی دەرگای ژوورەکەم بە ئاگای هێنام، ئەوانیش دەسە ناسکەکانیان بەرزکردەوە و گەیشتنەوە کەنار،لە کەنارێش چەن هەنگاوێ بە سەر ئاوی ڕووباری نیلەوە ڕۆیشتن،دوا ئاوڕ و زەردەخەنەیان لێدامەوە،دووبارە لە دەرگا درایەوە، منیش پتر بە ئاگا هاتمەوە،دڵم دەلەرزی، ئارەق بە نێوچەوانمدا دەچۆڕایەوە،بە پەلە چووم دەرگای ژوورەکەم بە دەسی لەرزۆکم کردەوە،هەردووکیان هاتنە ژوورەوە، (شیلان و هاوڕێکەی)، فریشتە ئاسا،هاتنە ژوورەوە،شانیان ماچکردم و منیش زۆر بە تامەزرۆوە، نێوچەوانیانم ماچکرد، وامدەزانی هەردوو خوشکە فریشتەکەی ئێستام بوون و هاتنە باوەشم. بە ڕەنگ و ڕوخسارم، کە سوور هەڵگەڕا بووم و ئارەقم کردبوو وا تێگەیشتن کە لەوان شەرمدەکەم، کە دانیشتین، بە ئارامیی و هێدی هێدی بە تەواوی بە ئاگا هاتمەوە، بە (زارا)ی هاوڕێی ناساندم،زارا گوتی:کاکە گیان، ئێمە هەموو تامەزرۆی ئەوەین بگەڕێینەوە کوردستان، گەر بۆ ساتێکیش بێ بچمەوە گوندەکەم و بە چەموباغی گوندەکەم چاو و دڵم ڕوونبێتەوە، پاشان گەر بشمرم گرنگ نییە، چونکە گۆشتوئێسکم، تێکەڵ بە خاکی گوندەکەم دەبێ، توخوا کاکە گیان فریامانکەوە و ئەو هیوایەمان بێنە دی.

گوتم: بە دڵنیاییەوە دەتانگەیەنمەوە، چونکە ئەوڕۆ چوومە لای پارێزەرێکی هاوڕێم و بەڵێنیدا هاوکارییمان بکات، داوای تەمەن و

وێنەتانی کردووە بۆ ( ناسنامە و پاسەپۆرت)،چونکە هەر بە ناوی کچانی میسرییەوە پاسەپۆرتان بۆ دەردەکات و ڤیزا و پسولەی ڕۆیشتنەوەمان بە فڕۆکە بەرەو عێراق تەواودەکات، تا سواری فڕۆکەش دەبین هەر چاودێرییمان دەکات.

شیلان گوتی:کاکە گیان دەسەکانت خۆشبێ،ئەنجامدانی ئەم کارانە هەر لە خۆتدێ.

زارا گوتی: ئەی ئەو هەموو پارەیە لە کوێ دێنی؟.

گوتم: بۆ (شیلان)م باسکردووە، بۆ ئەم مەبەستە بڕێ پارە لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە تەرخانکراوە.

شیلان گوتی: پارێزەرەکە چ کات ئەم کارانە ئەنجامدەدا؟

گوتم: سبەینێ کاتێ بڕەخسێنن،تا لای وێنەگرێ وێنەتان دەگرم.

شیلان گوتی: ڕۆژانە پشوومان لە کاژێری (یەکی) پاش نیوەڕۆ تا نزیک ڕۆژاوابوونە،لەو دەرفەتەدا دەتوانین هەر (حەوتمان) دەربچین و بێین وێنەکانمان بگرین.

کامێرای ڤیدیۆکەم لە جانتاکەم دەرهێنا وگوتم:لە ئەوڕۆوە دەسدەکەم بە وێنەگرتنتان، بۆ سبەینێش پاش نیوەڕۆ دێم تا بۆ لای وێنەگرێ بچین، بەڵام ئێستە دەمەوێ (تەمەنەکانتان) بە تەواوی بنووسم، تا سبەینێ لەگەڵ وێنەکانتان بیدەمێ.

زارا گوتی: (کاکە) گیان، ئەی ناوەکانمان؟

گوتم: ئەو بە ناوی (کچی) میسرییەوە، پاسەپۆرتەکان دەردەکات، دەبێ ناوی تازەتان بە باشی بزانن، تا لە فڕۆکەخانە هەڵە نەکەن.

شیلان گوتی:دەزانی کاکە گیان ئەمجارە ناوی تازەمان لێبنێن، هەر یەکێکمان دەبینە خاوەن سێ ناو،ناوی یەکەم لە لایەن دایک و باوک،

ناوی دووەم لەلایەن ڕژێم و خاوەن مەلهاکەوە، ناوی سێیەم سبەینێ دەیزانین.

زارا گوتی:گرنگ ئەوەیە بگەینەوە،جا چ ناوێکمان لێدەنرێ با بنرێ.

گوتم: ئینشەڵڵا لە سبەینێوە کارەکان ئەنجامدەدەین، بەڵکو لەم هەفتەیەدا بگەینەوە کوردستان.

گوتیان: قوربان زارت بین، کاکە گیان.

گوتم: ئێوە زۆر پیرۆزن ، پێویستە جوانترین پەیکەرتان بۆ بکرێ، کاتێ لە دەرگاتاندا،درەنگ کردمەوە، لە بە لەکۆنەکەدا سەیری ڕووباری (نیل)م دەکرد، هەردوو خوشکە ئەنفالکراوەکانم ببوونە دوو فریشتە و دڵیان خۆشدەکردم و زەردەخەنەی خۆشەویستییان بۆ دەباراندم، کە دەرگام لێکردنەوە وامدەزانی ئەوانن و ئەمشەو لام دەمێننەوە، بەڵام دڵنیابن ئێوەش ئەوانن، ئێوە وەك فریشتەکان پیرۆز و پاکوبێگەردن ، وەك (ئالاَ و کوردستان)، خوشکی خۆشەویستیی منن.

(شیلان و زارا)، بێدەنگبوون،پاشان شیلان هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:کاکە بۆ نەچینە بەلەکۆنەکە و لە نزیکەوە تەماشای ڕووباری نیل بکەین.

گوتم: بۆ نا، فەرموون با بچین.

هەر سێکمان بەرانبەر ڕووباری نیل وەستابووین، سەری ڕێزمان بۆ گیانی پاکیی ئەو دوو شەهیدە دانوان، تەماشای شەپۆلەکانم دەکرد، (ئالاَ و کوردستان لە سەر شەپۆلەکان نوستبوون، وەك بێشکەی منداڵییان بە هێمنیی ڕادەژێنران).

زارا گوتی: هەزارخۆزگەم بە خۆیان کە گەیشتنە کاروانی شەهیدان.

بەزەیی و سۆزم بۆ (شیلان و زارا)، وەك هەر دوو خوشکەکەم بوو، گریانم بۆیان دەهات،بەڵام حەزم نەدەکرد بە گریانەکەم دڵیان تەنگکەم، بێدرکاندنی یەك ووشە، دەسێکم خستە سەرشانی شیلان و دەسەکەی دیکەم سەرشانی زارا ،بە ئاسپایی، بەلەکۆنەکەمان جێهێشت و چووینە ژوورەکە دانیشتین،تا شەو درەنگیکرد وڕاشکا بە پرسیار کردن ووەڵامدانەوەی یەکدی بە سەرمانبرد.

پاشان من هەر لە سەر قەنەفەکە نوستم و ئەوانیش بۆ ژووری نوستن.

بەیانی زۆر زوو هەستابوون،ژوورەکەیان بۆ پاككردبوومەوە و جلوبەرگەکەیان بۆ شۆریبووم،ئەوسا هەڵیانساندم و گوتیان کاکە بڕیار ئێمە دەڕۆین. گوتم: پەلە مەکەن خۆم دەتانگەیەنم . هەردووکیان پێکەنین و شیلان گوتی: جلوبەرگەکەتمان شتووە، جارێ تەڕە و ناتوانی لەگەڵمان دەربچی.

گوتم: پێویستی ناکرد، بۆخۆتان ماندووکرد.

زارا گوتی:شەوێ ئێمە تۆمان زۆر ماندووکرد بە پرسیاکردن و نەمانهێشت بنووی.

شیلان گوتی:هەربۆیە جلەکانمان بۆ شتی، تا نەتوانی دەربچی.

گوتم: سوپاستان دەکەم،خوشکە بەڕێزەکانم.

لەو کاتەدا زەنگی تێلێفۆنەکە لێدرا ، دڵم خۆشبوو کە پارێزەرەکەیە، بەڵام کە هەڵمگرت خاوەن مەلهاکە بوو، لە ژووری کارگێریی ئوتێلەکە لە چاوەڕوانیی کچەکان بوو،منیش پارەیێ زۆرم بە کچەکاندا،تا بیدەنێ و لە خۆشی پارەکە ڕێگر نەبێ لە ئەنجامدانی کارەکانمان.زۆر بە ڕێزەوە شانیان ماچکردم، منیش سەرم ماچکردن و گوتم: لە کاژێر یەکی پاش نیوەڕۆ لە نزیك مەلهاکە دەتانبینمەوە. ماڵاواییان لێکردم و ڕۆیشتنەوە

بەرەو ئەو مەلهایەی کە شەویَ پیّیان دەگوتم ،"کاکە گیان، وا دەزانین ئەم چەندین ساڵە لە نیّو دۆزەخداین،توخوا کاکە گیان زوو ڕزگارمان بکە و بمانگەیەنەوە کوردستان."

## (١١)

دوو ڕۆژ لــه ئاڵۆزییــەکی بــاری دەروونیــی تــەواودا بــووم، دەترســام پارێزەرەکە لەگەڵمدا بە فێڵبێ.چوومە بەلەکۆنەکە و ڕوانییمە ڕووباری نیـل،پتر ترســام کـچان ئاشـکرابن و حکومـەتی میـسرییش بـۆ ئـەوەی نهێنیـەکانی بپـارێزێ، تووشــی دادگـایی تایبـەت بـە مـاف مـرۆ نـەبێ، فڕێیــان بداتــە ڕووبــاری نیلەوە،هــەر وەك چــۆن ســەدامی دیکتــاتۆر و خوێنڕێـژ ئەنفالـەکانی خستە نێـو لمـی بیابانـەوە.دڵـەڕاوکێ وئـاڵۆزیی دەروونیــیم، بێووزەیکردم،خـستیمیە خەیاڵـەوە،نیل ببــووە هــەژدیهایێ حەوت سەر و هەرحەوت کچەکەم لە نێو دەمی دەبینی، بە ئاگا هاتمـەوە و گـوتم: گـەر شـتی وا بـوو چیبکەم،مەگەر وەك دوو خوشـکەکانم خـۆم بخەمە (نیـل)ەوە و ئیدی ئەوسا،ئازارو خەمـەکانیش یەخـەم بەردەدەن. دەمویست بەو نیوەشەوە تێلێفۆن بۆ پارێزەرەکە بکەم، بەڵام نەمـدەوێرا وحەزمـدەکرد خـاوەنی بـەڵێنی خـۆم بم،چـونکە کـاتێ وێنـە و تەمـەنی کچەکانم بۆ برد،بەڵێنمان بە یەکدیـدا تـا دوو ڕۆژ بۆ نوسینگە نەچم و پێوەندیی پێوە نەکەم،لەبەر خۆمەوە گوتم: بڕوا ناکەم ئـەو کـوڕە باش و ڕۆشنبیرە بە فێڵبێ، پاشان نیوەی پارەکەم پێداوە، هێشتا نیوەی ماوە بیـدەمێ و بـۆ میـسریش پـارەیێ ئێجگـار زۆرە. بـا بـچم بنـووم، پـتر ئـەم خەیاڵانــە ئــازارم نــەدەن، ســبەینێ پــاش نیــوەڕۆ کــاتی وەرگــرتنی پاسەپۆرت و ناسـنامەکانە و بـۆ لای دەچـم، لـەو بڕوایـەدا نـیم یـەکێکی وەك ئەم پارێزەرە بیەوێ فێڵبکات.

# (١٢)

پاش نیوەڕۆ لە ئوتێل چوومە دەرەوە و بە پەلە تاکسیم گرت بۆ نوسینگەکە، کە گەیشتمە پرسگە، سکرتێرەکە گوتی: جەنابی پارێزەر لە چاوەڕوانییتدایە.چوومە ژوورەکەی، بە ڕوویەکی گەشەوە پێشوازیی لێکردم، گوتی:چونکە بە دڵێکی پاك،بۆ کارێکی مرۆڤ دۆستانە ئەم کارە ئەنجامدەدەی، زۆر بە ئاسانی کارەکان دەهاتە دەس و جێبەجێدەکرا.

جانتاکەی هێنایە پێشەوەو حەوت (پاسەپۆرت و ناسنامە)ی دەرهێنا، پاسەپۆرت و ناسنامەیەکی پێدام،نوسرابوو (مەدیحە عەبدولمونعیم ئەحمەد)، وێنەی (زارا)ی لە سەربوو،خۆشترین ساتبوو،نەمدەزانی چیبێژم،سەرمسوڕمابوو لە ئەنجامدانی کارەکەی چونکە زۆر بە سەرکەوتوویی و بێفێڵ بۆی تەواو کردبووین، گوتم: بە ڕاستی کارێکی زۆر مرۆڤانەت ئەنجامداوە، نازانم چۆن سوپاسی تۆ بکەم.

گوتی: من بە ئەرکێکی پیرۆزیی سەرشانمی دەزانم.

نەمدەزانی چیی بۆ بکەم تا دڵی خۆشکەم، بە پەلە دەسمبرد بۆ گیرفانم و نیوەی پارەکەی دیکەم پێدا.زۆر گوتی نامەوێ با ئەم نیوەیان لە سەرخۆم بێ،گوتم: دڵنیابە ئەمەی تۆ کردووتە، بە پارە ناپێورێ، چونکە هێند کارێکی پیرۆز و مرۆڤانەیە.

پارەکەی هەژماردە کرد و خستیە نێو جانتاکەیەوە و گوتی: دەزانی ئێستە چییم لێتدەوێ؟

گوتم: هەرچییت بوێ دەیکەمە سەرچاوانم.

گوتی: یەکەم، تەنیا ناسنامەکانت دەدەمێ بیدەی بە کچەکان تا ناوی تازەیان بە باشی بزانن و فێربن. دووەم، سبەینێ ڤیزا و برینی پسوڵەی فڕۆکە بەرەو عێراق تەواو دەکەم،بەلآم قازانجتان لێوەرناگرم،پارەی فەرمی چەندێکە هێندەتان لێدەسێنم. سێیەم،کە کارەکانم ئەنجامدا خۆم پێوەندییت پێوەدەکەم.

دووبارە سوپاسیم کردەوە و ناسنامەکانم لێوەرگرت و گوتم: ئەم شەو تا درەنگ ناوی تازەیان فێردەکەم،چونکە خوێندەواریان باش نییە. ئیدی با لە کاتت نەگرم،تا دیدارێکی دی بە خوات دەسپێرم و هیوادارم لە وێنەت هەر زۆربێ، ئەویش زۆر بە گەرمی مالآوابوونی لێکردم. بە پەلە خۆم گەیاندەوە ئوتێلەکە، پێوەندییم بە خاوەن مەلهاکەوە کرد، تا شەوێ (شیلان و زارا)م بۆ بنێرێ، ئەویش لە خۆشیی ئەوەی پارەی باشی بۆ دەنێرم زۆر بە زوویی گەیاندیانییە ئوتێلەکە.

هەردووکیانم زۆر بە باشی فێری ناوە تازەکانیان کرد، کامێرای ڤیدیۆکەم دەرهێنا و وێنەی ژوورەکە ،شیلان و زارا، بەلەکۆنەکە و ڕووباری نیل و هەموو ئەو دەورووبەرەم گرت.

پێمگوتن:لە ئەوڕۆوە سات بە سات ئەم کامێرای ڤیدیۆیە بەکاردێنم، تا فیلمێکی ڕاستەقینە و بەڵگەدار بەرهەم دێنم.

## (١٣)

دووەم ڕۆژ بوو، لە ئوتێلەکە نەدەچوومە دەرەوە، هەر لـە چاوەڕوانیی پێوەندیی پارێزەرەکە بووم، کاژێر چواری ئێوارە لـە ژوورەکەمدا بووم، لە ناکاو زەنگی تێلێفۆنەکە لێیدا، یەکسەر هەڵمگرت، پارێزەرەکە بوو گوتی: گەر بە ئەرك نەبێ، لە نووسینگەکەم لە چاوەڕوانیی جەنابتم.

سوپاسم کرد وگوتم: هەر ئێستە دەگەمە لای جەنابت.

یەکـە بـە یەکـەی پاسـەپۆرتەکانی بـۆ کردمـەوە، مـۆری ڤیزاکـەی پێشاندام و پسوڵەکانیشی خستە نێو پاسەپۆرتەکانەوە،پسوڵەی بۆ منیش تـەواو کردبوو.گوتی: سبەینێ لـە کاژێر(چوار)ی ئێوارێ دەبێ بگەینە فڕۆکەخانەی قاهیرە.

گوتم:ئەی جەنابت لەگەڵمان نابی؟.

گـوتی: چـۆن لەگـەڵتان نـابم، بـەڵام هەمیـشە چـەن مـەترێ لێتـان بـە دووردەبم، با کـەس نـەزانێ لەگەڵ ئێوەم، گـەر خـوا نـەکردە گرفتێکتـان تووشبوو،ئەوا هـەوڵی چارەسـەری دەدەم، چونکە زۆربـەی کارمەنـدانی فڕۆکەخانەکـە هـاوڕێی خۆمن،هـەر کـە سـەرکەوتن بـۆ نێـو فڕۆکـە و هەڵفڕین بەرەو ئاسمان، ئەو کاتە دڵم ئارام دەبێ و دەگەڕێمەوە.

گوتم:زۆر سوپاست دەکەم، ئێمەش حەز ناکەین لە پاش ڕۆیشتنمان تووشی هیچ گرفتێبی.

گوتی: سوپاس.

پاسەپۆرت و پسووڵەکانم وەرگرت و پارەیمدا.

گوتی: دەمەوێ سبەینێ جەنابت پێوەندییم پێوە بکەی.

گوتم:بە چاوان،کەواتە با زوو بڕۆم تا خۆمان بۆ سبەینێ ئامادەبکەین. ماڵاوابوونمان لە یەکدی کرد.

چوومەوە ئوتێل،تا گەیشتمە دەرگای ژوورەکەم، زۆر دەترسام، وامدەزانی خەڵکی گومانم لێدەکا، پاسەپۆرتەکانم توندتر دەگوشییە سەر سینگم، کە دەرگای ژوورەکەم کردەوە، بە پەلە چوومە ژوورەوە، پاسەپۆرتەکانم خستە ژێر سەرینەکەم، ئینجا دڵم ئارامبووەوە، ئەو ترسە تۆقێنەرە وازی لێهێنام.زەنگی تێلیفۆنەکە لێدرا، دیسانەوە دڵم ترسا، پاسەپۆرتەکانم لە ژێر سەرینەکە دەرهێنا وخستمە ژێر سیسەمەکەوە، تێلیفۆنەکەم هەڵگرت، کارگێڕیی ئوتێلەکە بوو. گوتی: خاوەن مەلهای (حەمرا)ت لەگەڵدایە.

گوتم: بەڵێ فەرموو.

گوتی:ئەی بەڕێز،چۆنی، ئەوڕۆ ئەو دوو کچە عێراقییە، چەن جارێ خۆیان هاتوون و یەخەم دەگرن تا ئەمشەو بۆلای جەنابت بێن.جا نازانم جەنابتان چیی دەفەرموون ؟

گوتم:زۆر ماندووم،بەڵام چونکە تۆ هەرچیی بڵێم لە قسەم دەرناچی، هەر بۆیە دەڵێم با هەر ئێستە بێن.

گوتی:بەڕێزم بە سەرچاو، نیوکاژێری دی، دەیانگەیەنمە لای جەنابت. دامخست و گوتم:(دە فەرموو ئەم گەوادە،خۆ گەر لە سەرەتاوە ئەم کچانە ئازا و قارەمان نەبوونایە، ئێستە ئەم سەگبابە شەوانە خۆی داوێنپیسانی بۆ دەدۆزینەوە) بە ڕاستی شایانی ئەوەیە بە بوتڵە بیرەکانی مەلهاکە، سەری بتەقێنی و لە ناوی بەری،وەك چۆن دوو

خوشکەکەم یەکێکیان لە ناو برد.زۆری نەخایاند لە دەرگایاندا،کردمەوە (شـــیلان و زارا) بوون،گلـــەییان دەکـــرد و دەیـــانگوت: ئـــەوڕۆ زۆر چـــاوەڕوانبووین،خۆمان دەچـــووین بـــۆلای خـــاوەن مەلهاکـــە تـــا بمانهێنێ،شـــیلان پێکـــەنی و گـــوتی: (کاکـــە)، دەزانـــی زۆری پێخۆشبوو،بەلأم لە هەمان کات سەری سوڕمابوو،چونکە دەیگوت: گەر زۆر ئارەزوو دەکەن چیی زۆرە پیاو زۆرە.ئێمەش دەمانگوت، تەنیا بۆ لای ئەم پیاوە دەچین چونکە خەڵکی عێراقە،جگە لەمیش بۆلای هەر کەسێ دیکە بێ، دەیکوژین.

گـوتم: ئێـوە سـەری کوردتـان بەرزکردووەتـەوە، بـە ڕاسـتی شـایانی ئەوەن خۆشترین مژدەتان پێبڵێم.

زارا گوتی:کاکە،زوو مژدەکەمان بدەرێ، ئێمە زۆرمـان پەلەیـە، هەموو هیـوام ئەوەیـە بگەمـەوە کوردسـتان و جـارێکی دی هـەوای کوردسـتانم هەڵمژم و چاو و دڵم بە ڕەزوباخی گوندەکەمان ڕوونبێتـەوە، گـەر ئەوسـا بشمرم، زۆر ئاساییە.

شیلان گوتی: نەك هەر ئێمە، کچەکانی دیکەش زۆر پەلەیانە.

پاسـەپۆرتەکانم لـە ژێـر قەرەوێڵکـە دەرهێنـا و پێـشانمدان و گـوتم: سبەینێ خۆتان ئامادەدەکەن،لە ئەسوانەوە دەچین بـەرەو فڕۆکەخانـەی قاهیرە، لەوێوە بەرەو عێراق.

هـەر دووکیـان پـەلاماری دەسـیاندام ماچیبکەن، بـەلأم فریـا کـەوتم هەستامە سەرپێ و نەمهێشت، شانیان ماچکردم، منیش باوەشم لێدان و سـەرم ماچـکردن،ئیدی هەرسێکمان باوەشمـان بـە یەکـدیا کـرد، زۆر گریاین.زارا بە گریانەوە گوتی: برا گیان خۆشترین مژدەت پێداین.

**گوتم:ئەی ئەم مژدەیەتان پێنەدەم بۆ براتانم، من وا هەستدەکەم ئێوە هەر دوو خوشکەکەمن.**

**هەریەکە و لە لایەکەوە دەگریاین،تا دڵمان ئارامبووەوە، پاش کەمێ بێدەنگی ، شیلان گوتی: کاکە بۆ وا بێدەنگی؟!!.**

**بە ڕوویەکی خۆشەوە گوتم: نازانم چ قسەیەکی دی بدۆزمەوە تا دڵتان خۆشکەم، تەنیا دەتوانم بڵێم ،سبەینێ دەڕۆینەوە، ئەمشەو دوا شەومانە، گەر حەزدەکەن، دەچینە دەرەوەی ئوتێل و بە کامێراکەم وێنەی ئەم دەڤەرە دەگرین.زۆریان پێخۆشبوو، هەر بۆیە بە پەلە کامێراکەم ئامادە کرد گوتم: فەرموون با دابەزین و بچینە دەرەوە.**

**لە پاش ئەنجامدانی ئەو کارانە، گەڕاینەوە بۆ ئوتێلەکە.**

**بەیانی زوو هەستاین، دیسانەوە کامێراکەم دەرهێنایەوە و هێندێ وێنەم گرت و فێری بەکارهێنانی کامێرەکەم کردن وگوتم: دەمەوێ زۆر بە نهێنی،وێنەی مەلهاکە،ئەو چێشتخانەیەی کاری تیادەکەن، بگرن. خۆم بە زوویی ئەوانم گەیاندەوە و گەڕامەوە بۆ ئوتێلەکە، ئینجا پێوەندییم بە پارێزەرەکەوە کرد، تا پێکەوە پلانێ بۆ چۆنیەتی ڕۆیشتنمان دابنێین.ئەویش گوتی ئەوڕۆ مۆڵەتم وەرگرتووە هەر ئێستە وەرە بۆ نوسینگە.**

## (١٤)

تا نزیك نیوەڕۆ لە نوسینگەکە دانیشتم.زانی زۆر سوورم لە سەر ئەنجامدانی کارەکە بەو پەڕی نهێنییەوە، هەر بۆیە گوتی: خەمت نەبێ نیوەڕۆ دەچینە ماڵی ئێمە، پاش نانخواردن پاسێکی خزمی خۆم هەیە دەیهێنم، بەڵام گەرچی خزمی خۆمە، حەزدەکەم وابزانێ لیژنەیەکن و بۆ وەرگرتنی زانیاری لە بارەی عێراقەوە دەچن.

لە سەرەتاوە حەزم نەدەکرد بچم، کەمێکیش دەترسام پیلانێ بێت بۆ لە ناو بردنم و بردنی ئەو پارەیەی کە هەموویم لە گیرفاندایە، چونکە بەیانی پارەی ئەو چەن ڕۆژەی ئوتێلمدا و چییم لە سەریان مابوو وەرمگرتەوە، جگە لەوەش پاسەپۆرتەکانیشم لە جانتاکەیە، بەڵام هەر چەندێ سەرنجی پارێزەرەکەم دەدا، دڵنیادەبووم، چونکە ڕوویەکی گەش و پاکوبێگەرد و بێفێڵی پیشاندەدام. هەربۆیە کە چووم بۆماڵەکەی بۆچوونەکەم زۆرڕاستبوو،هاوسەرێکی خنجیلەی لەگەڵدا دەژیا، زۆر ڕێزیان لێگرتم، خێزانەکەی دەیگوت: دەبێ چەن ڕۆژێ بمێنێتەوە و بۆ ئوتێلەکە نەچیتەوە ، ئێرە ماڵی خوشك و برای خۆتە. بەوەدا زانیم پارێزەرەکە هێند نهێنیی پارێزبوو، تەنانەت لای خێزانەکەی نەیدرکاندووە.زۆر سوپاسمکرد و گوتم: ئەوڕۆ بەرەو عێراق دەچمەوە، لەبەر ئەوە داوای لێبوردندەکەم، بەڵام گەرجارێکی دی بۆ ئەسوان هاتم، بەڵێنبێ ناچمە ئوتێل و بۆ ئێرە دێم.

گوتیان: به هاتنت گەوره دەبین.

زۆرسوپاسم کردن و به پارێزەرەکەم گوت: دەزانی زۆر درەنگە.

سەیرێکی کاژێری کرد و گوتی: پێوەندییم به خزمەکەمەوه کردووه، ئێسته دەگاته جێ.

لەگەڵ قسەکەیدا (هۆڕنی پاسەکه)مان گوێ لێبوو. ماڵاواییم لەو ژنه زیرەك و رۆشنبیره کرد و لەگەڵ پارێزەرەکه سواری پاسەکه بووین بەرەو دەوروبەری مەلهاکه.

شیلان و زارا له پێش دەرگای چێشتخانەکه چاویان دەگێڕا، له دوورەوه دەسم بۆ بەرزکردنەوه، تا زوو بێن و سواربن،چونکه حەزمان نەدەکرد نزیك بکەوینەوه.ڕوویان گەشبووەوه، به پەله چوونه ژوورەوه، کچەکانی دیکەش دەرچوون، بەرەو لای ئێمه دەهاتن، بەڵام (شیلان و زارا)یان لەگەڵ نەبوو،له پاش چارەکه کاژێرێ، ئەوسا دەرکەوتن، زۆر شپرزه ببوون، له سەرەتاوه ترسام شتێ بووبێ، بەڵام یەکێ له کچەکان گوتی: له ئێستەوه تا ڕۆژاوا پشوومانه.

پارێزەرەکەش له پێشەوه بێدەنگ دانیشتبوو، خۆی به شتەکانی نێو جانتا دیبلۆماسیەکەیەوه خەریککردبوو.

زارا و شیلان سەرکەوتن،کامێراکەم لێوەرگرتن، پارێزەرەکه به شوفێرەکەی گوت: پەله بکه با به زوویی بگەینه فرۆکەخانەی قاهیره.

له پێش فرۆکەخانەکه وەستاین ،پارێزەرەکه گوتی: فەرموون بڕۆنه ژوورەوه، منیش خۆم له دوورەوه چاودێریتان دەکەم تا هەمووتان له پشکنین ڕزگاردەبن.ماڵاواییمان لێکرد و چووینه ژوورەوه.

پاسەپۆرت و پسوولەکەم پێدان و گوتم:خوشکەکانم، من له ریزی پشکنینەکه،له پێشتانەوه دەڕۆم، هەوڵدەدەم پشکنەرەکه تووڕەبکەم،

بەڵام دوای من کە نۆرەتان هات، بە ڕوویەکی خۆشەوە پاسەپۆرتتانی پێبدەن. گەرپرسی بۆچیی بەرەو عێراق دەڕۆن،بڵێن: ئێمە لیژنەیەکی شوێنەوار ناسین، بۆ سەردانی عێراق دەچین.

چووینە ڕیزەوە، کە نۆرەم هات، (پاسپۆرتەکەم) بە شێوەیێ زۆر ناشیرین فڕێدایە پێش پشکنەرەکە،مۆرەیەکی لێکردم، گوتم: بۆ وا تەماشام دەکەی، مۆری لێدە و بیدەرەوە دەستم.

گوتی: تۆ خۆت بە چیی دەزانی، بە هیچ شێوەیێ تۆ بەڕێ ناکەم، چیی دەکەی بیکە.

گوتم: بە ئارەزووی تۆ نییە، تەواوی بکە با بۆ نێو فڕۆکەکە بچم.

بێدەنگبوو، هەر دوو دەسی نایە هەر دوو لا ڕوومەتی و گوتی: کەس بەڕێ ناکەم.

شیلان هاتە پێشەوە و گوتی: ئێمە تاوانمان چییە، جارێ ئێمە بەڕێ بکە، دوایی بۆ خۆتان لە یەکدی تێبگەن.

پاسپۆرتەکەی لە شیلان وەرگرت و بە پەلە و بێ پرسیارکردن مۆری لێدا،تا هەموویانی بەڕێکرد، وەستابووم و قسەم نەدەکرد.

ئینجا ڕووم تێکرد و گوتم: تکایە ئەوەی من تەواو بکە، سەرێکی بادا و زۆر بە جوانی و پەرە بە پەرەی پاسپۆرتەکەی پشکنی، چەندین پرسیاری لێدەکردم، بەڵام چونکە ئەوەی خۆم پاکبوو، نەدەترسام.

ئەویش مۆری لێداو بە هەمان شێوە بۆی فڕێدامەوە و گوتی: بڕۆ.

لە نێو فڕۆکەکە،لە تەنیشت (زارا)وە دانیشتم، لە لایەکەوە ترس ڕووی داپۆشیبووین، بەڵام تا لە فڕۆکەخانەکە بەرزدەبووینەوە بەرەو ئاسمان، ترسمان کەمدەبوەوە،لێشاوێ لە خۆشیی ڕوویەکی گەشی

پێدەبەخشین، چەن بەرزتر دەبووینەوە، قاهیرە بچوکتر دەبووەوە، ڕووباری نیل وەك هەژدیهایەکی بریقەدار دەردەکەوت.

کاژێریَ لە ڕۆیشتندا بووین،هەموو بێدەنگ ببووین، تەماشایەکی ڕەنگ و ڕوخساری زارام کرد،ترسێکی زۆر دایپۆشیبوو،گوتم: زارا گیان، خوشکەکەم بۆ وا دەترسی،لە فڕۆکەکە مەترسە ودڵنیابە بە سەلامەتیی دەمانگەیەنێتەوە.

گوتی: کاکە گیان لە فڕۆکە ناترسم ،بەڵام ئێمە چالاکییەکمان ئەنجامداوە، دەترسم فڕۆکەکە بگەڕێننەوە.

منیشی زۆر ترسان گوتم: بۆ چیی بووە و چییتان کردووە؟!!.

گوتی: ژەهرمان کردوەتە نێو خواردەمەنی و (مەزە)ی مەلهاکەوە،تا ئەو داوێنپیسانە بکوژیَ.

گوتم:بە ڕاستانە،باشە ئێوە ئەم ژەهرە لە کوێوە دێنن،چۆن دەستتان کەوتووە؟!!.

گوتی: کاتیَ لە بەندیخانەوە بەرەو میسر هاتین، هەمووان تووشی (خورشت)ێکی زۆر بووین،کە بە خاوەن مەلهاکەمان گوت لەشمان زۆر دەخوریَ،زۆر ترسا گوتی و با بتانگەیەنمە دکتۆر،پارەیەکی زۆرم لێتان خەرجکردووە،هەر بە پەلە بردینی ،پاش پشکنین، دکتۆرەکە گوتی: ئەمانە لە شوێنێکی زۆر پیسبوونە،بۆیە تووشی ئەم خورشتە هاتوون.

سەرو یەك بوتڵی ژەهری نووسی گوتی: زۆر ئاگادارین، لە ملتان بە خوارەوەی پیَ چەوردەکەن،هەرگیز نەکەن بیخۆنەوە،هەر بگاتە گەدەتان و پاشان کە گەیشتە نێو خوێنتان یەکسەر دەتانکوژیَ.

ئێمەش ئەو ڕێنماییەمان زۆر بە هەلزانی،هەمیشە شوشەییَ ژەهر لە نێو جانتاکانماندایە،گەر هەرکەسیَ ویستی بە زۆر کاری خراپمان

لەگـەڵ بكات،بـە قـسەی خـۆش نزیكدەبینـەوە و دەڵـێین لـە پـاش خواردنەوەی یەك پێك ئینجا ڕابواردن دەكەین، (كاكە بڕیار تۆش ئەو شەوەی شیلان بۆ لات هات،گەر خۆتان بە زوویی نەناساندایە،دووربێ و هەزارجار لێت بە دووربێ،ژەهر خواردی دەكردی).

ئێمـەش سـاڵانە ئـەو (خورشـتە) دووبـارە دەبـوورەوە و كارەسـاتی دڵتەزێنی ئەنفالیی دەهێنایەوە یادمان،ڕقوكین و هێزی گیانیی تۆڵەی تێدا بە تینتردەكـردین.ئـەو ژەهـرەش هەمیشە بـە بوتـڵ لـە شـوێنێكی تایبـەتیی ژوورەكـەمان هـەبوو.لەگـەڵ شـیلان بڕیارمانـدا هـەموو ئـەو ژەهرانـەی هەیـە، بیكەینـە خـواردن و مـەزەی مەلهاكـەوە، بـۆ كوشـتنی هـەموو داوێـن پیـسان و پیـاو خراپـانی مەلهاكـە لـە تۆڵـەی هـەردوو شەهیدمان(فاتیمە و فەهیمە). كاتێ ئێوە لە نێو پاسەكە لە چاوەڕوانیی مـن و شـیلان بـوون، چـالاكییەكەمان ئەنجامـدەدا ،تۆمـاری باشـترین چالاكییمان بۆ خەباتی (هێزی گیانیی تۆڵەی كچان) كرد،ئەو هێزە لە بن نەهاتووەی كە هەمیشە جێی شانازی ئێمەی كچانی ئەنفالكراوە.

لە سەرەتاوە كەمێ ترسام لە ژەهراویكردنی خواردنی مەلهاكە، بەڵام قسەكانی وورەی بەرزكردمەوە، وایلێكردم، گوتم: دەستانخۆش خوشكە بەڕێزەكەم، بە ڕاستی ئێوە هێزی لە بن نەهاتووی گەلمانن، بەڵێنبێ هەر گەیـشتینەوە، یەكـەم داواكـارییم، دروسـكردنی پەیكەرێكـە لـە كـچانی ئەنفالكراو.

گوتی: سوپاس كاكە گیان. تۆ بڵێی بگەینەوە كوردستان؟!!.

گوتم: دڵنیابە ،چەن كازێرێكە و دەگەینەوە.

كامێراكەم دەرهێنا و وێنـەی نێو فڕۆكەكە و یەكە بە یەكـەی كـچانم دەگرت.

لە بڵندگۆی تایبەتیی فڕۆکەکە، ئاگاداریمان کردینەوە، چووینەتە خاکی عێراقەوە،لە پاشان گەیشتینە سەر پایتەخت،بەغدایەکی بچووک بە گڵۆپ ببووە چراخان،لەگەڵ نیشتنەوەدا هێدی هێدی بەغدا گەورە دەبووەوە،باوەشی بۆ کچانمان دەکردەوە، زۆر شەرمەزاربوو کە ساڵانێ ڕژێمێکی دڕندەی لە خۆگرتبوو بۆ لە ناوبردنی کورد و مرۆڤایەتیی.

هەرگەیشتینە فڕۆکەخانە،بە پەلە پێوەندییم بە (وەزیری مافیی مرۆڤ)وە کرد،

گوتم:حەوت لە کچانی ئەنفالی فرۆشراو بە میسرم هێناوەتەوە،بەڵام دەمەوێ فریامان بکەوی،چونکە لە ترسی تیرۆریستان، ناتوانم بە حەوت کچەوە بچمە نێو (بەغدا) و لە ئوتێلەکان بمێنمەوە،ناوێرم بە ئۆتۆمبیلێکی تایبەت بێمەوە ،نامەوێ ئەم کچانە جارێکی دی تووشی دەردەسەریبن.زۆر خۆشحاڵبوو،گوتی:

تەنیا دە خولەکێ چاوەڕوانبن،وەڵامتان دەدەمەوە.

هەموو کپوبێدەنگ،بڕوایان نەبوو ئەوانن گەیشتوونەتەوە.منیش بڕوام نەدەکرد کە توانیم حەوت کەس لە کچانی ئەنفال بێنمەوە.

تەلەفۆن لێدراو بانگیانکردم،وەزیر بوو گوتی:هەر ئێستە هێلیکۆپتەرێ دێ تا بە سەلامەتیی بتانگەیەنێتە فڕۆکەخانەی کوردستان.

گوتم:زۆر چاکە،ئەمشەو هەموو دەچینەوە ماڵی ئێمە، سبەینێ بۆلای جەنابت دێین.

دووبارە سوپاسیکردم.

هەر حەوت کچەکە چوار دەوریان گرتبووم.

شیلان گوتی:چیی گوت، چیی بکەین؟!!.

گوتم: کاژێرێ دی،بە هێلیکۆپتەر دەڕۆینەوە بۆ کوردستان.

## (١٥)

لە پاش کاژێرێ لە چاوەڕوانیی، دەنگی هێلیکۆپتەر دەهات، هەموو گوێڕایەڵ بووین،نەمانتوانی پتر دانیشین،چووینە لای پەنجەرەکانەوە تەماشامان دەکرد،بە شێنەیی دەنیشتەوە،کە تەواو نیشتەوە چەن کەسێ دابەزین وڕوو لە هۆڵەکە دەهاتن.

کە گەیشتنە هۆڵەکە ئەفسەرەکەیان گوتی:کاك (بڕیار)کێیە؟.

گوتم: بەڵێ.

گوتی: جەنابی وەزیر ئێمەی ناردووە بتانگەیەنینەوە کوردستان.

کامێراکەم گرت بە دەسەوە و دووبارە وێنەگرتنم دەسپێکردەوە. کچانم بە ئەفسەر و سەربازەکان ناساند.

گەیشتینە فڕۆکەخانەی کوردستان، نیشتینەوە، سێ لاندکرۆزی تایبەت بە وەزارەتی مافیی مرۆڤ لە چاوەڕوانییدا بوون.

گەیشتینە پێش دەرگای ماڵی ئێمە، سوپاسی هەموانم کرد بۆ ئەو ماندووبوونەیان، گوتم: سبەینێ بۆ وەزارەت دێین.

ئەوان ڕۆیشتن، تەنیا من و کچەکان ماینەوە.

لە دەرگامدا، زۆر دەترسام لە ناکاو دایکم بمبینێ شتێکی لێبێ.

دەرگای کردەوە و گوتی:قوربانت بم کوڕە شیرینەکەم، باوەشی لێدام و تێرماچی یەکدیمان کرد. گوتی : ئەی کوا خوشکەکانت؟!!.

گوتم: دایکە گیان بۆجارێ ناڵێی فەرموو وەرنە ژوورەوە؟.

دایکم گوتی: قوربانتـان بم، وەرنـە ژوورەوە با تێر ماچتان بکەم. بە ڕاستی ئەمشەو چاوودڵم پێتان ڕوونبووەوە.

کە دانیـشتین گـوتم: دایکـە گیـان ئەمانـە حـەوت کـچی ئـەنفالن و لـە میسرەوە هێنامنەوە.

دایکم گوتی: ئەی ئالآ و کوردستان؟!!.

زارا گوتی: دایە گیان ئێمە هەموو کچی تۆین.

گـوتم:دایکـە گیان دڵـی خـۆت تـەنگ مەکە،ئەمانـەش خوشـکی مـن و کچی تۆن.

دایکم سەری لێشێوابوو، خۆشی و زەردەخەنە و گریان تێکەڵ ببـوو، دەسی بەرزکردبووەوە و نزای دەکرد و دەیگوت:خوا گیان لە تۆ بە زیـاد بێ،زۆر سوپاس،هێدی هێدی دڵی هێوربووەوە، گریانی کەمبووەوە.

گوتی:کچەکانم زۆر لە مێژە چاوەڕوانیی گەڕانـەوەی ئـەنفالکراوانین. چاوەڕوانیی مێرد ، کچ و کەسـەکانمان و خـەڵکی گوندەکان، تـا ئێستە چارەنووسییان نادیارە و دەڵێن هەموو خراونەتە ژێر لمی بیابانەوە.

هەموو ئەبڵەق بوون،گوتیان تۆ چیی دەڵێی دایکە؟!!.

گوتم: خوشکەکانم، دەمەوێ ڕاستی کارەساتی ئەنفال بـزانن، چونکە سبەینێ هەر دەبێ بیزانن، بەڵام تکام وایە خۆگرین،ئێوە ئەندامی هێـزی گیانیی تۆڵەن.ڕژێم ١٨٢ هەزار کەسی بە منداڵ ، ژن ، پیـاو، پەککەوتـە، لاوان و کچانەوە، بەندکرد و گوندەکانی ڕوخاند و سـوتاند، ئـەو سـەد و هەشـتاو دوو هـەزار کەسـە چارەنووسـییان نادیـارە، لـەو هـەموو کەسە،سێ کەس توانیان خۆیان دەرباز بکەن، یەکیان کە ناوی (تەیمور) بوو، چاوپێکەوتنیان لەگـەڵ ئەنجامدا گـوتی:لـە نیوەشـەودا، دەخراینـە

ژێر لمەوە، بەڵام ئەو بە هەزار دەردەسەری ڕزگاربببوو، دەیگوت: شەوانە بە شۆفەلْ چاڵیان بۆ هەڵدەکەندن دەخرانە چاڵەوە،بە لم دادەپۆشران.

هەر یەکە و لە ئاستی خۆیەوە دەسیکرد بە هاوار و گریان.

زارا گوتی: کاکە بەیانی ئێمە کەسە ئەنفالکراوەکانمان نابینینەوە؟!!.

دەسمکردە ملی،تێر گریام گوتم: حەزم نەدەکرد ئەم هەواڵەتان بدەمێ، بەڵام ڕاستییەکە و دەبێ بیزانن.ماڵمان بووە پرسەیێ،خۆمیش دەگریام، نەمدەزانی چۆن دڵیان بدەمەوە.

گوتم:من جگە لەو دوو خوشکەم، باوك ، مام و خاڵ و زۆربەی کەسەکانم ئەنفالکراون و ڕۆیشتن، تەنیا من و دایکم ئەنفال نەکراین.

تا نیوەشەویش تەواو تێپەڕبوو،کەسمان نەماندەتوانی بنووین، چاوەکان ووشکبوون، فرمێسك کۆتایی هات، ئیدی هەر یەکە و باسی سەرگوزەشتەیەکی دەکرد.

هەرمێ گوتی:(باوکم و دوو ئامۆزام زۆر بە ڕەزیلی و نامۆیی گرتیانن، لەو کاتەی کۆپتەر ئەو دەڤەرەی دەپشکنی،هێلیکۆپتەرەکە هاتە سەریان، تەواو نزیکبووەوە، باوکم گۆچانەکەی دەسی ڕادەوەشاند، دەیویست شەڕ لەگەڵ کۆپتەرەکە بکات،گۆچانەکەی پتر ڕادەوەشاند تا نەهێڵی کۆپتەرەکە بنیشێتەوە،هەردوو ئامۆزاکەم ڕایانکردە نێو چەمەکەوە، هەموو خەڵکی ئاوایی تەماشامان دەکرد، کە نیشتەوە، چەن چەکدارێ پەلاماری باوکیاندام ، باوکمیش هەر بە گۆچانەکەی دەیویست شەڕیان لەگەڵدا بکات،هێند سەری لێشێوا بوو، وایدەزانی بە گۆچانەکی دەتوانێ شەڕ لەگەڵ ئەو دڕندانە بکات،چوونە چەمەکەوە، هەردوو ئامۆزامیشیان گرت، هەرسێکیان خستە نێو کۆپتەرەکەوە و چوون بەرەو نێو شار، بەڵام لە ڕێ هەر دوو

ئامۆزاکەمیان لە ئاسمانەوە فڕێ دایە خوارەوە و شەهیدبوون،کاتێ گوندەکەیان ئەنفالکردین و ئێمەیان گەیاندە (نوگرە)،لەوێدا، باوکمان بینییەوە، هێند ئازاریان دابوو نەدەناسرایەوە، جگە لەوەش زۆر برسی بوو،برینەکانی هێشتا ساڕێژ نەبوون، لە سەرە مەرگدا بوو گوتی: "من دەمرم،بەڵام خۆزگە زووتر دەمردم وئێوەم لەم شوێنە نەدەبینی، کوڕەکانم ئاگاداری خۆتانبن، ئاگاداری ئابڕووی خوشکەکانتان بن، دوا سەرنجی هەمووانیدا و گیانی سپارد، هەر لە دەرەوەی بەندیخانەکە تەرمەکەیان شاردەوە).

دایکم گوتی: ئەو سەدامە، گەر ڕۆژی پارچەیێ گۆشتی لێبکەنەوە، هێشتا کەمە.گوێش مەدەنێ چیی بە سەر کورد هێنا،خودا خراپتری لێکرد،(هەر دوو کوڕەکەی کوژران و جەرگی بڕا، کونیش نەما خۆی تێنەنێ و هەر لە نێو کون زۆر بە ڕەزیلی و بێغیرەتانە خۆی بە دەسەوەدا ،تەنانەت ژن و کچەکانی بەرەو وولاتان ڕایانکرد. ئەمە موعجیزەیێ بوو وخودا پێشانیدا).

گوتم:دایکەگیان ڕاستە فەرمووی، پێشینانش ڕاستیان گوتووە کە دەڵێن "هەموو شتێ لە باریکیی دەپسێ، تەنیا زوڵموزۆرداریی لە ئەستووریی دەپسێ".

ئیدی هەمووان،دەریای خەیاڵێکی بێسنوور لوولی دابووین، نەمدەویست بە ماتومەلوولی بیانبینم،گوتم:خوشکەکانم زۆر برسیمە، دەزانم ئێوەش برسیتانە.

دایکم گوتی:داوای لێبووردن دەکەم،لە خۆشیی ئێوە، لە بیرم چوو لێتان بپرسم ئاخۆ نانتان خواردووە یا نا.

شیلان و نازەنین لەگەڵ دایکم چوون بۆ چێشتخانەکە، بەڵام دایکم زوو گەڕایەوە، گوتی: نایەڵن و دەڵێن خۆمان خواردن ئامادە دەکەین.

گوتم: دایکەگیان ماڵی خۆیانە و لێیانگەڕێ با بە ئارەزووی خۆیانبێ. دایکم گوتی:خوا دەکات بە ئێمە ڕازییدەبن،هەمیشە خۆیان خاوەن ماڵ دەبن.

زارا گوتی: سوپاستان دەکەین، بە ڕاستی بووینە ئەرك بۆتان.

گوتم: ئێمە سوپاستان دەکەین، ماڵمان بە ئێوەوە ئاوەدانە، وا بۆ حەڤدە ساڵ دەچێ هەر من و پیرە دایك پێکەوە دەژین.

نەرمین گوتی: زۆر لە مێژە چاوەڕوانیی باوەشی کوردستان و ئامێزی خێزانێکی کوردیین.

گەلاوێژگوتی: یا خوا سەدام لەوەش خراپترت بە سەربێ، کە نەتهێشت لە گوندەکان و لە باوەشی خێزانمان بحەسێینەوە، پێش کارەساتی بەدناوی بە ناو ئەنفالیش، بە بۆردوومانی گوندەکانمان بە فڕۆکە و کۆپتەر تۆقاندبووینی.

گوتم: زۆر ڕاستە، گەر دایکم بێتەوە یادی،( ڕۆژێکیان لە نێو حەوشەکەماندا بووین، مارێکم بینی هاوارم بۆ باوکم کرد، باوکم هەزار ڕەحمەتی لێبێ، پەلاماریدا بیکوژێ، بەڵام ڕایکردە ئەو (کونە فڕۆکە)یەی دروسمان کردبوو بۆ خۆشاردنەوەمان لە فڕۆکەی سەدام.

وا ڕێکەوت لەو کاتە فڕۆکەکان هاتن، بە ناچاری و هەر بە پەلە چووینە کونەکەوە، سووریش دەمانزانی مارەکەیشی تێدایە).

شیرین گوتی: ئەی مارەکەتان نەکوشت؟

گوتم: خۆی خستبووە نێو درز و کونی بچووکی نێو حەشارگەکە.

ترس وایلێکردبووین بیر لەوە نەکەینەوە مارەکە پێمانەوە دەدا یا نا!!.

بە گێڕانەوەی ئەم سەرگوزەشتە و بەسەرهاتانە،تەواو دڵمان ئارامبووەوە، هاوبەشی و چوونیەکی خەموئازارەکان، دڵسۆزیی و خۆشەویستییمان لە بۆ یەکدیی بە تینترکرد.

دایکم گوتی: کچەکانم، ئێوە هیچ جیاوازییتان نییە لەگەڵ (ئالاّ و کوردستان)، هەر بۆنی ئەوانتان لێدیّ، وا دەزانم گیانی پاکوبێگەردیان لەگەڵ ئێوە هاتە نێوماڵەکەمان، ئێرە ماڵی خۆتانە، هیچ کات خۆتان بە میوان و غەریب نەزانن، تا مردن پیکەوە ژیان بە سەر دەبەین.

زارا گوتی: دایکە گیان ئێمە سوپاسی تۆ و کاک بڕیار دەکەین، بەڵام ئێمە دەبیّ سبەینیّ بچینەوە گوندەکانمان، جارێکی دی چاو و دڵمان بە بینینیی چەم و ڕەزوباخی گوندەکانمان ڕوونبێتەوە.

شیلان بانگیکردین گوتی: فەرموون وەرن بۆ نانخواردن.

لە پاش نانخواردن، گوتم: فەرموون خوشکەکانم، لەگەڵ دایکم بچن بنوون و منیش دەچمەوە ژوورەکەی خۆم.

## (١٦)

له کاژێر١٠ی بەیانی ،وەزیری مافیی مرۆڤ، چەن ئۆتۆمبیلێکی بۆ ناردین تا بچین سەردانی بکەین. کە چووینە ژووری جەنابی وەزیر، زۆر خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بە گەڕانەوەی کچانی ئەنفال، زۆر دەسخۆشکەری لێکردم لە ئەنجامدانی ئەم کارە. دوو کاژێر،لای وەزیر ماینەوە، تا کچان باسی سەرگوزەشتە و بەسەرهاتەکانیان بۆ جەنابی وەزیر کرد. ئەویش زۆر بە پەرۆشەوە گوێی بۆ گرتبوون،هەناسەی ئاه وحەسرەت و خەمی هەڵدەکێشا، ڕووی کردە من و گوتی: بە ڕاستی کارێکی زۆر پیرۆزت ئەنجامدا. دووبارە خێرهاتنەوەی لێکردین و گوتی:ئەم کچانەمان چییاندەوێ، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە دەبێ جێبەجێبکرێ.

زارا گوتی:ئێمە کە حکومەتی کوردیی وئەم ئازادییە دەبینین،چاو و دڵی بە تەواوی ڕوونکردووینەتەوە،تەنیا داواکاریی من،گەر بۆ ساتێکیشبێ، بینینەوەی گوندەکانمانە تا چاومان بە کوردستانمان ڕوونتر بێتەوە.

گوتم: گەر جەنابی وەزیر، بفەرموێ بە دابینکردنی هێلیکۆپتەرێ، تا دۆڵ بە دۆڵ و گوند بە گوندی کوردستانیان پێبناسێنینەوە، جێی ڕێزمان دەبێ.

وەزیر گوتی: بە چاوان، سبەی بەیانی خۆتان ئامادە بکەن، وە لە لایەن وەزارەتەکەمانەوە دیارییەکی بچوك بە بڕی پێنج هەزار دۆلار بە هەر یەکێك دەبەخشرێ، تا بتوانن پێداویستییان پێدابینکەن، تەنانەت کاك (بڕیار)یش ئەو دیارییەی پێدەبەخشرێ.

گوتم: زۆر سوپاس، بەڵام هێندێ داواکارییم نووسیووە سەبارەت بە کچەکانمان، دەمەوێ بیخەمە ڕوو.

گوتی:فەرموو چییتان هەیە بیڵێن.

گوتم: پەیکەری کچێکی ئەنفال دروسبکرێ،مەشخەڵێکی بە دەسی بەرزکردبێتەوە ، لە بەرزترین لوتکە دابنرێ، لە ساڵیادی ئەنفال مەشخەڵەکە داگیرسێنرێ، تا ببێتە هێمای سەرکەوتنی خەباتی(هێزی گیانیی تۆڵەی کچان) دژ بە دوژمن و جەللادەکان، بۆ ئەوەی نەوەکانی ئێستە و داهاتوو توانای پۆڵاییینی کچانمان لە بیر نەکەن، وەك چۆن هێمای ئاگری نەورۆز بە سەرکەوتنێکی پیرۆزیی کوردمان دادەنرێ و چەندین ساڵە یادی دەکرێتەوە و لە بیرناچێ.

دووەم: هەژدە کچمان لە میسر ماوە، بۆیە دەمەوێ ڕۆژنامە و کەناڵەکان گەڕانەوەی ئەم حەوت کچە بڵاو نەکەنەوە و زۆر نهێنیی بێ، چونکە گەر حکومەتی میسر بزانێ، ئەو هەژدەیە دەگرێ و لە ناویان دەبا تا تاوانبار نەکرێ بە بەشداربوونی لە کارەساتی ئەنفال.

سێیەم:ئەم کچانە لە گوندەکانی خۆیان خانوویان بۆ دروسکرێ.

دوا داواکاری تەرخانکردنی مووچەیە، تا بتوانن بەو مووچەیە بژین.

جەنابی وەزیر گوتی: هەر ئێستە دەچین بۆ لای سەرۆکی هەرێمی کوردستان، تا لە نزیکەوە بتانبینێ،بە زوویی داواکارییەکان جێبەجێبکات. لەگەڵ جەنابی وەزیر چووین بۆ لای سەرۆك و هەر لەگەڵ

خـۆی گەڕاینـەوە.سـەرۆکیش خۆشـحاڵی خـۆی پێـشاندا و واژۆی داواکارییەکانی کرد، سووربوو لە سەر زوو جێبەجێکردنی.

شیلان گوتی:ئێستە دڵمان زۆر خۆش و بە ئارامە،چونکە قوربانیانی کارەساتی ئەنفال و کیمیاباران و هەموو ئەو شەهیدانەی لە پێناو کورد و خـاکی کوردسـتان گیانیـان سـپارد،خوێنیان بـە فـیڕۆ نەچـوو، ئـەم ئازادییـەی ئـەوڕۆی لێدەسـەبەربوو،زۆریش گرنگـە پارێزگـاریی لـەم ئازادییـە بکـەین و چـییدی نـەهێڵین دوژمنـان خاکمـان داگیربکـەن و کوردمان لە ناو بەرن.

گوتم: زۆر خۆشحاڵم وا بیر دەکەنەوە، هیوادارم لە وێنەتان زۆربێ.

ڕێـزان گـوتی: لـەو کاتـەوەی فرمێسکم لـە چاوانی وەزیـر و سـەرۆك بینی، کاتێ باسی بەسەرهاتەکانمان بۆ دەکردن، هێند دڵخۆشبووم ، وامدەزانی باوك و برا و کەسە ئەنفالکراوەکانمان زیندووبوونەتەوە.

بـە ئۆتۆمبیلـەکانی وەزارەت گەیشتینەوە پێش دەرگامـان، دایکم لـە چاوەڕوانییدا بوو، بەڵام نەك تەنیا چاوەڕوانیی من، چاوەڕوانیی حەوت کـچی دی،چونکە زۆر دڵـی بـەو کچانە دەکرایـەوە، خـۆی ووتـەنی بۆنی (ئاڵا و کوردستان)یان لێدەهات.

لـە نزیکـی عەسربوو،تریفەخان و (هیـوا) و چـەن فەرمانبـەرێکی دی بۆ ماڵ هاتن،کچەکانم پێناساندن،ئەوانیش خۆشحاڵییان بە گەڕانەوەیان دەربڕی.

هیـوا پێیگـوتم: بـە ڕاسـتی شـوێنت دیـاربوو، کـەی بـۆ فەرمانگـە دەگەڕێیتەوە؟

گوتم: چەن ڕۆژێکی دی دەگەڕێمەوە.

دایکم گوتی: کوڕەکەم، هاوڕێکانت زۆر سەردانیان دەکردم ، لە من پەرۆشتر بوون ،بە تایبەت تریفەخان.

گوتم:دایە گیان من هەمیشە گوتوومە تریفەخان خوشکمە، خوشکیش دەبێ بۆ برای دڵسۆزبێ.

هیوا لەگەڵ کچەکان کەوتە گفتوگۆ،دایکم و زارا و هەرمێ چوون بۆ چێشتخانەکە تا عەسرە چایێ ئامادە بکەن.

بە هەلمزانی و بە تریفەم گوت:هەواڵی ئەوین چییە؟!!.

گوتی:هەواڵێکم پێیە، بەڵام ئێستە نایلێم، کەی بۆ فەرمانگە هاتییەوە، هەواڵەکەت پێدەگەیەنم.

زۆر گوتم هەواڵەکە چییە، ئێستە بیلێ.

گوتی:هیچ هەوڵمەدە، دڵنیابە ئێستە ناتوانم بیدرکێنم.

گوتم: هەواڵەکە خۆشە یا ناخۆشە.

گوتی:لەوانەیە خۆشبێ، لەوانەیە ناخۆشبێ.

گوتم: ئەم هەواڵە وامليدەكات ڕۆژێ زووتر بۆ فەرمانگە بێمەوە.

گوتی: منیش ئەوەم دەوێ.

هیوا گوتی: هاوڕێیان نەڕۆین.

گوتم: جارێ پەلە مەکەن، با شتێ پێکەوە بخۆین، پاشان،هیوا گیان کەمێ کارم پێت هەیە.

گوتی:بە چاوان. بفەرموو.

گوتم: هیوا گیان،بە بڕیاری وەزیر و سەرۆکی هەرێمی کوردستان، لاندکرۆزێ تایبەتییان بۆ کچان دیاریکردووە تا لە خزماتیانبێ،جگە لەوەش هیلیکۆپتەرێ تەرخانکراوە، تا بە زووترین کات بتوانن سەردانی گوندەکانیان بکەن،من دەبێ لەگەڵیان بچم و دەمەوێ تۆش

بێی و کامێراکەت پێدەم، تا ئەرکی وێنەگرتنەکە بکەمە ئەستۆی تۆ، بەڵکو ئەمجارە خۆمیش لە وێنەکان لەگەڵ ئەم خوشکانەم دەربچم.

گوتی:بە چاوان،سبەینێ دەکەمە مۆڵەت و بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە دێم.

پاش ڕۆیشتنی میوانەکان،شیلان گوتی: کاکە حەزدەکەین بۆ نێو بازاڕ بچین،تا هێندێ پێداویستی و کەلوپەل بکڕین.

گوتم: هەر ئێستە تێلێفۆنێ بۆ شوفێری ئۆتۆمبیلە تایبەتەکەتان دەکەم،چونکە جێتان لە ئۆتۆمبیلەکەی من نابێتەوە، تا خۆتان ئامادە دەکەن،ئەویش دەگاتە ئێرە.

لە بازاڕیش دەمەوێ (سیم کارت و مۆبایل)تان بۆ بکڕم. تا هەر کاتێ ویستم، پێوەندییتان پێوە بکەم.

## (١٧)

لە کاژێری (٩)ی بەیانی بوو، دوو لاندکرۆز هاتنە پێش دەرگا، تا بمانگەیەننە شوێنی هێلیکۆپتەرەکان. کچانیش جلوبەرگی کوردییان لەبەرکردبوو، هێند جوانبوون نەمدەناسینەوە. پێوەندییم بە (هیوا)وە کرد تا بە زوویی بگاتە ماڵ و لەگەڵماندا بێ.

پاشـــئەوەی هـــەموو ئامادەبووین،بـــەرەو فرۆکەخانـــە بردیـــانین، هێلیکۆپتـەریان ئامادەکردبوو،هـەموو سـوار بـووین و هـەڵفڕین بـەرەو دۆزینەوەی لانەی کچانی ئەنفال ،لیستێکم بە ئەفسەرەکەدا و گوتم: ئەم کـچانەمان خـەڵکی ئـەم گوندانـەن، گەیـشتینە هـەر گونـدێ، یـەکجار بە سەریدا بسوڕێوە،تا دڵنیابن ئایا گوندەکانیان ئاوەدانبووەتەوە یا نا، با چاو و دڵی کچانیش بە بینینەوەی گوندەکانیان ڕوونبێتەوە .

ئەفسەرەکەش نەخشەیەکی تایبـەتیی پێبوو،کـە دەگەیـشتینە سـەر هەر گوندێ لەو گوندانە،پێیدەگوتین ،کچانیش فرمێسکیان وەك بارانی بەهار لە چاوەکانیان دەباری،گەیشتینە سەر گونـدی،ماڵی (زارا) گـوتی: توخـوا کـەمێ نزیکبکەوە،ئـەوە چـەم و ڕەزو بـاخی گوندەکەمانـە،دڵیان نەشـکان،بە تـەواوی نزیککەوتەوە،بـە ئەفـسەرەکەی گـوت: توگـۆڕی شـەهیدان دەرگاکـە بکـەرەوە بـا تێـر هـەوای گوندەکـەمان هەڵمـژم، کـە دەرگاکە کرایەوە، گوتی: ئیدی توانام نەما،با گۆشت و ئێسك و خوێنم تێکـەڵ بـە خـاکی گوندەکـەم بـێ، یەکسەر خۆی لـە دەرگاکـەوە فڕێدایـە

خوارەوە، ئەو خۆشییەمان لێبوو بە شین، تا بە تەواوی نیشتینەوە، کچان هاواریاندەکرد و دەیانگوت زارا گیان بۆ خۆت کوشت،خۆ گەیشتینەوە ئەو شوێنەی چەندین ساڵە هیواو ئاواتمان بوو، هەموو بە پەلە بۆ لای زارا ڕامانکرد،لە سەر پشت و لە ژێر سێبەری دار هەنجیرێ کەوتبوو،هەر چاوی بە نێو دیمەنی ئەو دەڤەرە دەگێڕا،هێشتا گیانی نەسپاردبوو،وێنەی ئەو دەڤەرەی دەخستە نێو ئەلبومی چاوییەوە، تا بۆ تاهەتایە لە پێش چاوی وون نەبێ.سەریم خستە سەر ڕانم، گوتم: زارا گیان بۆ واتکرد ؟!!.

گوتی: گرنگ ئەوەیە گەیشتمەوە گوندەکەمان، سوپاس بۆ تۆش کاکە بڕیار،بە هۆی تۆوە  پێش مردنم گوندەکەمانم بینییەوە، دەمەوێ هەر لە گوندەکەمان بمنێژن،چونکە دەمرم و دەچم بۆ لای دایک ، باوک ، براکان و هەموو ئەنفالکراوان تا ئازادبوونیی کوردستانیان پێڕاگەیەنم، دوا سەرنجی لە هەمووواندا،چەن دڵۆپێ لە فرمێسکە گەشەکانی بۆ کردینە دیاریی و گیانی پاکی سپارد،ئەلبوومی چاوەکانی (زارا)م بە پێڵووەکانی داخست. شینی کچان لە نێو ئەو چەموباخە دەنگی دەدایەوە، ئەو خەڵکەی لە شالاّویی ئەنفال ڕزگاربببوون،گوندیان ئاوەدانکردبووەوە  لە چاوەڕوانیی کەسوکارە ئەنفالکراوەکان بوون،لای ئێمە کۆببوونەوە. کە (زارا)یان ناسییەوە، پیاوێ پیر بە باپیری دەرچوو، بە کورکە کورکی گریانەوە، نزیککەوتەوە،چاوەکانی کردبووەوە بۆ بینینی کوڕەزاکەی و دەسە لەرزۆکەکەی بە نێوچەوان زارا هێنا ، گوتی:کچەکەم بۆ وات لە خۆتکرد، من زۆر لە مێژە چاوەڕوانیی باوك و دایك و تۆ و (شالاّوی برات)م ،زارای نایە سەر ڕانی خۆی، ماچیدەکرد و بۆنی پێوەدەکرد، دەیگوت:بۆنی کوڕە تاقانەکەمت

لێدیّ،خۆزگە من دەبووم لە جیاتی باوکت، گوشییە خۆی و لە کوڵپەی گریانیدا، شیوەنی خەڵکی گوند و کچانی ئەنفال، دار و بەردی چەمەکەیشی دەهێنایە گریان.

لە سەر ڕاسپاردەی خۆی، هەر لە گوندەکە بە مەراسیمیّ شکۆدار بە خاکمان سپارد، هێلیکۆپتەرەکە گەڕایەوە،بەڵام ئێمە ماینەوە، پرسەمان بۆ دانا، هەواڵی ئەو بەسەرهاتە دڵتەزێنە و گەڕانەوەی کچانی ئەنفال، گەیشتبووە خەڵکانی ئەو دەوروبەرە، هەر بۆیە زۆربەی کەسوکاری ئەنفالکراوان بۆ سۆراغی کەسەکانیان هاتبوون،لە بارەی کچانی ئەنفالکراوەوە پرسیاریان لێدەکردم، چونکە زانیبوویان من ئەم کچانەم هێناوەتەوە، لەبەر ئەوە لە لیستێکدا ناوی (شەش کچەکە و گوندەکانیان)م نووسی و لە سەر دیواری مزگەوتی گوندەکە هەڵمواسی.

لە دووەم ڕۆژی پرسەکە، کەسوکاری چوار لە کچەکان پەیدابوو، یەکیان تەنیا نەنکی مابوو، سێیان براکانیان کە لە کاتی کارەساتی ئەنفال پێشمەرگەبوون، لە سێیەم ڕۆژ، خاڵۆی شیلان ، مامی هەرمیّ هاتن و هەموو بە یەکدی شادبوونەوە.

## (١٨)

چوومەوە ماڵی خۆمان، دایکم زۆر بە پەرۆشەوە پرسیاری کچەکانی کرد، حەزم نەدەکرد بەم کارەساتە بزانێ کە (زارا) خۆی کوشتووە، بەلاّم پێمگوت کچەکان بە کەسەکانیان شادبوونەتەوە، زۆر دڵیخۆشبوو، پێیگوتم: هەواڵێکی خۆشت پێدام بەلاّم نازانم تۆ بۆ هێند دڵتەنگ و خەمباریی؟!!.

ئەو کارەساتە هێند دڵتەزێنبوو، ماندووبوونی و خەم بە ڕوومەوە دیاربوو،نەمدەتوانیی ڕووم بە گەشوخۆشیی پێشاندەم، بەلاّم پێمگوت: دایەگیان جیابوونەوە و ماڵاوابوونیان، دڵتەنگی کردووم.ئەو شەوە تا درەنگ لە ژوورەکەی دایکم بووم، پاشان ، دەسەکانیم ماچکرد و شەو شادم لێکرد و چوومەوە ژوورەکەی خۆم.

نەمدەتوانی بنووم، بە تایبەت کە دیمەنی خۆفڕێدانی (زارا) دەهاتە پێش چاوم، پێویستم بە خواردنەوە بوو، بەلاّم هیچ لە سەلاجەکەم نەبوو، بەو خەیاڵانەوە خەو بردمییەوە. لە نزیک بەرەبەیان بە ئاگاهاتم،چوومە دەرەوەی ژوورەکەم، گوێم لە نزا و پاڕانەوەی دایکم بوو،دەیگوت:خوایە ئەم کوڕەم بپارێزیی،دڵی چاکبکەی وئەمجارە ژن بێنیّ.

بەزەییم پێدەهاتەوە، دەمگوت: خۆزگە ئێستە (ئەوین) لێرە دەبوو، هەر لە سبەینێوە داخوازییم دەکرد و ئاواتی دووەمی خۆم و هیوای

دایکم بۆ بینینیی وەچەکانی دەهێنایە دی، بەڵام ئاخ، ئەو هیوایە نایەتە دی.

بەیانی خۆم ئامادەکرد تا بە ئۆتۆمبیلەکەم بچم بۆ فەرمانگە، بەڵام نەمدەتوانی ریشم بتاشم، بەو شێوەیە چوومەوە بۆ فەرمانگە، زۆرخێرهاتنەوەیان لێکردم، دەسخۆشکەرییان لێدەکردم بۆ دۆزینەوە و هێنانەوەی کچانی ئەنفالکراو، سەرەخۆشییان لێدەکردم بۆ شەهید بوونی (زارا). چوومەوە ژوورەکەم، هیوا لە شوێنەکەم دانیشتبوو، کە بینییمی یەکسەر هەستا گوتی: فەرموو وەرە شوێنی خۆت، ئەم شوێنە شایستەی جەنابتە. ویستم نەچم، بەڵام نوسراوێکی بۆ دەرهێنام گوتی: ئەمە فەرمانی دەسبەکاربوونەوەتە. کە ویستی جێمبێڵێ،گوتم: هەموو فەرمانبەرانم بینی،تەنیا تریفەخان نەبێ، بۆچیی؟.

گوتی:ئەورۆ مۆڵەتە،سبەینێ دێتەوە.جێیهێشتم و بۆ ژووری خۆی چووەوە. ئێجگاری خەم دایگرتم،چونکە تریفەخان ئەو کەسە بوو دڵم پێدەکرایەوە.

فەرمانبەری ڕاگەیاندن هاتە ژوورەوە،ڕۆژنامەی بۆ هێنام و گوتی: هەواڵێکی تێدایە، سەبارەت بە وولاتی میسر.

بە پەلە پەڕەکانی ڕۆژنامەکەم هەڵدایەوە،بە مانشێتێکی گەورە نووسرابوو "ژەهراوی کردنی خواردن و خواردنەوە و مەزەی مەلهایێ لە میسر " کە خوێندمەوە نووسرابوو لە (مەلهای حەمرا) لە شاری ئەسوان،حەوت کارمەندی کچ کە لە چێشتخانەی مەلهاکە کاریان دەکرد، خواردن وخواردنەوە و مەزەی مەلهاکەیان ژەهراوی کردووە و ڕایانکرد، هەموو ئەو کەسانەی ئەو شەوە لەوێ کاتیان بە سەر دەبرد،

ژەهراوی بوون و بە زووترین کات بۆ نەخۆشخانەیان بردوون،لە ئاکامدا دوو لاو گیانیان لە دەسدا،ئەوانی دیکە لە مەترسی ڕزگاربوون.

خاوەن مەلهاکە داوا لە حکومەتی میسر دەکات،بە زووترین کات ئەو کچانە دەسگیر بکات و بدرێنە دادگا.

هەستامە سەرپێ گوتم:دەستانخۆش،بە ڕاستی چالاکییەکی زۆر بێوێنەتان ئەنجامدا بۆ هێزەکەتان، "هێزی گیانیی تۆڵەی کچان".

زەنگم لێدا و داوای (هیوا) م کرد، هاتە ژوورەوە، پێشئەوەی پرسیار بکا،ڕۆژنامەکەم پێشاندا وگوتم:دەزانی پاڵەوانانی ئەم کارەساتە کێن؟!!.

گوتی: هێشتا نەگەیشتوومەتە ئەو لاپەڕەیە.

گوتم: لە ڕۆژنامەکە ناوی پاڵەوانەکانی نەبردووە، بەڵام تەنیا من باشیان دەناسم.

گوتی:چۆن دەیانناسی،؟

گوتم:(شیلان) و(زارا)، پاڵەوانیی ئەو چالاکییەن.

هیوا گوتی:بە ڕاستە؟!!.

گوتم: زۆریش بە ڕاستمە، شیلان ئەو بەسەرهاتە باشتر دەزانیٚ.گەر دەتوانی پێکەوە بەرەو مەزاری شەهید زارا دەچین وچەپکیٚ گوڵ دەکەینە دیاریی و ئەم ڕۆژنامەیەش وەك تەلقینیٚ،بۆی دەخوێنمەوە، تا بە ئارامیی بۆ تا هەتایی لە گۆڕەکەی پشووبدا.

گوتی:حەزدەکەم هەر لەوێوە سەردانی کچەکانی دیکەش بکەین و ئەم هەواڵە خۆشەیان پێڕاگەیەنین، دەمەویٚ لە زاری (شیلان)ەوە گوێبیستی چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەم چالاکییە بم.

## (١٩)

شەو گەڕامەوە ماڵ، بە دایکم گوت: هەواڵێ خۆش هەیە، نازانم بیڵێم یا نەیڵێم؟.

گوتی:زۆر لە مێژە چاوەڕوانیی هەواڵی خۆشم، ئەی بۆ نایڵێی.

گوتم:دەزانی ئەو ڕۆژەی کچەکانمان بۆ بینین و سەردانی گوندەکانیان برد. (زارا)،لە هێلیکۆپتەرەکەوە خۆی فڕێدایە خوارەوەو گیانی پاکی سپارد.

گوتی: ئەیرۆ،کوڕەکەم ئەمە هەواڵی خۆشە،دەیدایە سەرڕانی خۆیا و کەوتە گریان و لاوانەوە، دەیگوت خۆزگە نەدەمبینی نەدەمناسی.

گوتم: سێ ڕۆژ پرسەمان بۆ دانا، بە هۆی پرسەکەوە، شەش کچەکەی دی بە کەسوکاریان شادبوونەوە،بەڵام دایکە گیان دەزانی هەواڵە خۆشەکە چییە؟ بێدەنگبوو، هەستێکی ڕاگرت، گوتی: چییە؟!.

گوتم: ئەو شوێنەی ئەم کچانە کاریان لێدەکرد،دروسکردنی خواردن و خواردنەوە و مەزە بوو بۆ سەرخۆش و چاوچنۆك و داوێنپیسان.

لە دوا ساتیان لەو شوێنەدا،هەموو ئەو خواردنەیان (ژەهراو)ی کرد و دوو کەس بەو ژەهراوی بوونە مردوون.

دایکم گوتی: مەڵێ مردن، بڵێ تۆپین، ئەی دەسیانخۆشبێ.

گوتم:دایکەگیان،ئەو (زارا)یەی کە بە خاکی گوندەکەیان سپێردرا، پاڵەوانیی ئەو چالاکییە بوو.دایکم چەن سەلاواتێکی لێدا، گوتی: خوا

گیان لای تۆ ئاشکرایه ئەم کچانه چەن بێتاوانن،نزات لێدەکەم و لێت دەپاڕێمەوه گیانی پاکی شەهید زارا به بەهەشت شادبکەی.

کوڕەکەم،گەر دەتەوێ لەم هەواڵه خۆشترم پێبلێی،لەمەولا بیر لە ژن هێنان بکەوه،با پێش مردنم چاو و دڵم به بووك و وەچەکانت ڕوونبێتەوه.

هەناسەیەکم هەڵکێشا گوتم: دایکه جارێ واز بێنه،لەوانەیه بۆ میسر بچمەوه تا ئەو هەژده کچەی دیکەش دەدۆزمەوه و دەیانهێنمەوه.

گوتی: دڵنیابه ئەمجاره نایەڵم.

گوتم: دایکه گیان داوای لێبووردنت لێدەکەم، له پاش (ئەوین) ناتوانم کچی دی بکەمه هاوسەر و ژیانی لەگەڵ به سەر بەرم. شەوت شاد دایکەگیان، دەچمەوه ژوورەکەم.

له ژوورەکەم، مێزەکەم ڕازانەوه، دەسمکرد به خواردنەوه، بەلاّم ئەو شەوه زوو نوستم، چونکه ماوەیێ بوو نوستنم نەمابوو.

بەیانی له ئاوێنەکه تەماشای خۆم کرد، ڕیشم زۆر هاتبوو، چوومه گەرماو، خۆم شۆری و تراشم کرد، پاشان ئەو قاتەی که ئەوین زۆر به دڵی بوو، له بەرمکرد، خۆم بۆن پرژێن کرد.

دایکم ڕوانییه سەراپام و تێر بۆن و ماچی کردم گوتی: کوڕەکەم، زۆر جوان و شیرینی له دڵم، توخوا ئاگاداریی خۆت به.

دەسەکانیم ماچ کرد و گوتم:خەمت نەبێ.

سواری ئۆتۆمبیله خنجیلەکەم بووم، له دوامەوه دۆلکەیێ ئاوی ڕژان. زۆر بەزییم پێداهاتەوه، که له ڕادەبەدەر خۆشی دەوێم و لەو هەموو کەسوکارەی،تەنیا منی ماوه.

گەیشتمە فەرمانگە و چوومە ژوورەکەم، لە دەرگا درا، کە فەرمووم کرد، تریفەخان هاتە ژوورەوە.زۆر خێرهاتنەوەی لێکردم.

گوتم: پێش هەموو شتێ،هەواڵ ئەوین چییە؟چونکە خۆت گوتت هاتییەوە بۆ فەرمانگە، ئەوسا هەواڵەکەت پێڕادەگەیەنم.

گوتی: دایکی ئەوین، کۆچی دوایی کردووە.

گوتم: کەی و چۆن؟.

گوتی:کە ئەوین لەگەڵ هاوسەرەکەی بۆ سوید چوون،دایکی ئەوین وهەریمی برای لە چاوەڕوانیی (زاوا) و (هەوراز)ی برای بوون،تا ئەمانیش بگەیەننە سوید،بەلاّم زاوا زۆر ناپاك دەرچوو بەرانبەر هەورازی هاوڕێی،زۆر بۆ ئەوین خراپبوو، دڵی لێپیسکردبوو، دەیگوت تۆ زۆر جوانی،هەر لەبەر ئەوە، لە شوقەدا و لە نێوان چوار دیواردا دەرینەدەکردە دەرەوە و بەندیکردبوو،جگە لەو دڵپیسییەی،جاروبار ئازاریدەدا و بەرانبەری زۆر توندڕەو بوو،(ئەوین)یش یەك مانگ توانای خۆگری هەبوو،لە پاشئەوە بە (هەوراز)ی برای گوت: کە ئەو هاوڕێ خۆشەویستەت زۆر بۆم خراپە.

(هەوراز)یش کە لێیکۆڵیەوە و بۆی دەرکەوت قسەی خۆشکەکەی زۆر ڕاستە،بە (زاوا)کەی گوت:دەمەوێ واز لە خوشکم بێنی،چۆن من بە پیاوانە خۆشکی خۆم پێشکەشکردی،دەمەوێ تۆش پیاوانە وازی لێبێنی، لە سەرەتاوە دەیویست لێیجیانەبێتەوە،زۆرنکۆڵیی دەکرد کە بۆی خراپ نییە ،بەلاّم (هەوراز) گوتی:دەبێ واز لە خوشکم بێنی،گەر نا،ئەوا بۆ دادگا دەچم و جگە لەوەی کە بە ئاسانی وازی لێدێنی،ئینجا لە سەر توندڕەویت بەرانبەر ژن،چەن مانگێ بەند دەکرێی. ئەویش زۆر ترسا، ناچار وازی هێنا،کە دایکی ئەوین هەواڵی جیابوونەوەکەی

پێگەیشت،یەکسەر جەڵتە لێیدا،دوو ڕۆژ لە نەخۆشخانە بوو، سێیەم ڕۆژ گیانی سپارد.

گوتم: بەڕاستی زۆرم پێناخۆشە و هاوبەشی خەمی (ئەوین)م.ئەو ماڵە (ئەوین)یان بە هەندەران فرۆشت.

تریفە گوتی: لە دەسەڵاتی ئەوین نەبوو،دوو براکەی هەڕەشەیان لێدەکرد و دەیانگوت: دەبێ ڕازیبی تا هەموومان بۆ سوید بچین.

گوتم:ئێستەش براکانی ڕازیبن و (ئەوین) لە بیری نەکردبم حەزدەکەم بیکەم بە هاوسەرم و بووکی دایکم.

تریفە گوتی:بە ڕاستە کاك بڕیار، تۆ بە ئەوین ڕازیی دەبی؟!!.

گوتم: دڵنیابە،مەگەر ئەو بە من ڕازیی نەبێ وهەندەران بیر و بۆچوونی گۆڕیبێ.

گوتی: گەر ئەوین گوێی لەم قسەیە دەبێ، لە خۆشییان شێت دەبێ، لەو ڕۆژەوەی لە هاوسەرەکەی جیابووەتەوە، تێلێفۆن دەکات و زۆر هەواڵت دەپرسێ کە گەڕاویتەوە لە میسر یا نا.گەر دەتەوێ هەر ئێستە پێوەندیی پێوەدەکەم،تا قسەی لەگەڵ بکەی.

گوتم: ئێستە ناتوانم قسە بکەم، بەڵام ژمارەی تێلێفۆنەکەم بدەرێ، بەڵکو شەو قسەی لەگەڵ دەکەم. ژمارەکەم وەرگرت.

تریفە گوتی:دوو خولەکێ خۆم قسەی لەگەڵ دەکەم،بڵندگۆی مۆبایلەکە دەکەمەوە،تۆ تەنیا گوێ بگرە.بە مۆبایلەکەی پێوەندیی بە (ئەوین)وە کرد.

تریفە گوتی:بەیانیت باش ئەوین گیان،چۆنی .

ئەوین گوتی:زۆر باشم، تەنیا دووری ئێوە خەمبارم دەکات،هەستیی غوربەتییم پتر دەکات.

تریفـە:خۆشـترین هـەواڵت پێـدەدەم تـا کـەمێ لـە خـەمبارییت کەمبکەمەوە.

ئەوین:زۆر لە مێژە تامەزرۆی هەواڵی خۆشم.

تریفە:خۆشترین هەواڵ لای تۆ، چییە؟

ئەوین:خۆشترین هەواڵ لای من، گەڕانەوەی (بڕیار)ە بۆ کوردستان.

تریفـە:کـاك بڕیـار هاتووەتەوە،حـەوت کـچی ئـەنفالی لەگـەڵ خۆیـدا هێناوەتەوە، بەڵام دوو خوشکەکەی لە سەر ئابڕووی خۆیـان یـەکێکیان کوشتووە و خۆیانیش خستۆتە ئاوی نیلەوە.

ئـەوین:دەسخۆشـکەری لێدەکەم،لـە هـەمان کـات هاوبەشـی خـەمیم بـۆ دوو خوشـکەکەی،زۆر حـەزدەکـەم لەمـەولا بـە خۆشـیی بـژی،زۆرجار پێیـدەگوتم، ئـاواتی یەکـەمم، هێنانـەوەی کـچانی ئەنفالـە، بـەڵام دووەم تۆی، بە داخەوە من بووم بە بێوەژن و تازە منی ناوێ.

تریفە:گەر ڕازیی بێ،تۆ شووی پێدەکەی؟

ئەوین: بۆ بێوەژنێ وەك من دێنێ،هەر کچی جوان زۆرە.

تریفە: دڵنیابە زۆر ڕازیی ەبێ، بە نیازیشە پێوەندییت پێوە بکات.

ئەوین: بە ڕاستە؟!!، قەت باوەڕ ناکەم.

تریفە: ژمارەکەی لێسەندووم تا پێوەندییت پێوە بکات.

ئەوین: زۆر شەرم دەکەم لەگەڵی قسە بکەم.

تریفە: شەرمی بۆ چییە، ئێوە یەکدیتان زۆرخۆشدەوێ.

ئەوین: دەبێ ئەو ڕۆژە بێ و ببێتە هاوسەرم؟

تریفـە:لـە چـەن ڕۆژی داهاتوو،بۆمـان دەردەکەوێ،ئێـستە بـە خـوات دەسپێرم.

ئەوین:زۆر سوپاست دەکەم خۆشترین هەواڵت پێدام،منیش بە خوات دەسپێرم، خوشکە بەڕێزەکەم.

سەرمسوڕمابوو،ئەو دەنگە بە سۆز و ناسکەی ماوەیێ بوو لە گوێم بڕابوو، ئەم بەیانییە بووە سەمفۆنیایێ.

گوتم: نەمدەزانی هێند بە وەفایە و منی هەر لە یادە.

تریفە گوتی:دوا  بڕیارت چییە؟

گوتم:ئەوڕۆ کۆبوونەوەیێ زۆر گرنگ هەیە، سەبارەت بە کچانی ئەنفالکراو و فرۆشراو بە وولاتانی عارەب،هەر کە بۆ ماڵ ڕۆیشتمەوە، پێوەندیی پێوەدەکەم ،دڵی دایکمیش خۆشدەکەم، بووکێ بێوێنە، زۆر جوان، ناسکتر لە پەڕەی گوڵی پێشکەشدەکەم.

تریفە گوتی:گەر ئەم کارە ئەنجامدەی،هیچ جیاوازیی نییە لەگەڵ هێنانەوەی کچێکی ئەنفالکراو.

گوتم: لە سەرەتاوە دەمگوت،ئەوین ئەنفالکراوە، لە لایەن برا و دایکییەوە فرۆشراوە.

لەو کاتەدا (هیوا) هاتە ژوورەوە گوتی: کاک بڕیار ئامادەی بۆ کۆبوونەوەکە.

گوتم: یەك چارەك کاژێری دیکە ئامادە دەبم.

تریفەخان یارمەتیی وەرگرت و ڕۆیشت.

ئێمەش خۆمان ئامادە کرد بۆ کۆبوونەوە تایبەتەکەمان.

(٢٠)

که چوومەوە، بە سەرهاتەکەی ئەوین زۆر کاری تێکردبووم، نەفرەتم لە براکانی و گۆڕەکەی دایکی دەکرد، کە چۆن لە پێناو پارە و چوونە هەندەرانی خۆیان، ئەو کچە پاکوبێگەردەیان بەو دەردە برد.

دایکم هەستی پێکردم، گوتی: کوڕەکەم، بەیانی دڵت زۆر خۆشبوو، کەچی ئێستە ڕوو شێواو و دڵتەنگی.

گوتم: دایکە گیان،جیهان لەوپەڕی پێشکەوتندایە، کەچی تا ئێستە لە کۆمەڵگەکەمان، زوڵم و زۆرداریی بەرانبەر کچان هەر ماوە و دەکرێ.

دایکم گوتی: کوڕم مەبەستت چییە و چیی بووە؟

گوتم: دایکە گیان، دەزانی ئێستە (ئەوین) لە کوێیە؟

گوتی: لە هەندەرانە.

گوتم: ڕاستە لە هەندەرانە، بەڵام، لە هاوسەرەکەی جیابووەتەوە و لەگەڵ براکەی دەژی، دایکیشی بەم بە سەرهاتەی (ئەوین)، تووشی جەڵتە دەبێ و دەمرێ.

دایکم گوتی: زۆرم پێناخۆشە، بەم بە سەرهاتانەم نەزانیووە.

گوتم: تریفە بۆی باسکردم.

گوتی: تریفە بۆ لام زۆر دەهات ، بەڵام بۆی باس نەکردووم.

گوتم:حەزی نەکردووە برینت بکولێنێتەوە بە باسکردنی ماڵی ئەوین.

دایکم گوتی: تازە ئەوین بە ئێمە چیی، بووە بێوەژن.

گوتم:دایکە گیان بۆ(ئەوین) نەکەم بە بووکت،لەو ژیانەی ڕزگاربکەم.

گـوتی: کوڕەکـەم،تۆ گـەنجێکی جـوانیی، ئاسـتیّ بـەرزت لـە نێـو فەرمانگـە و کۆمەڵگـە هەیـە،کام کـچی جـوانیی ئـەم شـارەش هەیـە، بـە سوپاسەوە پێت ڕازیی دەبیّ، کەچی دەتەویّ بێوەژنیّ بێنیّ.

گوتم: دایکەگیان، دڵنیابە، جگە لە ئەوین، ناتوانم کەسێکی دی بکەم بە هاوسەرم و بووکی تۆ،جا دەمەویّ هەر ئێستە ڕازییبی تا پێوەندیی پێوە بکەم.

دایکم گوتی: کوڕەکەم ئارەزووی خۆتە، لەو دایکانە نیم ببمە کۆسپ لە پێش حەزو ئارەزووی کوڕ و کچەکانم.

گوتم:کەواتە ڕازییت ئەوین بێنم؟.

گوتی: بە مەرجیّ، بەڵێنم پێبدەی بۆ (میسر) نەچییتەوە.

گـوتم: سـەبارەت بـە (میـسر)،ئـەوڕۆ کۆبوونەوەیـەکمان ئەنجامـدا، لیژنـەییّ تایبـەتمان بـۆ بـە دواداچـوونی چارەنووسـیی هـەژدە کـچی ئـەنفالی فرۆشـراو بـە میـسر پێکهێنـا، تـا بـە شـێوەییّ فـەرمی لـە کاربەدەستانی میسر داوا بکەین،ئاگاداریان بکەینەوە،نکۆڵی لێنەکەن و بە شێوەییّ نهێنیی هاوکارییمان بکەن،ئەگینا ڕێپێوان لە سەرانسەری جیهـان بـۆ سـەر باڵیۆزخانـەکانی میـسر سـەبارەت بـەو هـەژدە کـچە ئەنجامدەدەین. دوو لیژنەی دیکەمان پێکهێنا، یـەکیان بۆ ئەنجامـدان و دروسـکردنی خـانوو و پێداویـستییەکانی کـچەکان،دووەمیان بـە دواداچـوونی دروسـکردنی پەیکـەری کـچێکی ئـەنفال لـە لایـەن هونەرمەنـدانی شێوەکار. ئـەم کارانـەش لـە مـاوەی دوو مانگـدا دەبـیّ جێبەجێبکریّ ،خۆمیش سەرۆکی لیژنەکانم.. کاك (هیوا)ش جێگرمە.

دایکەگیان گەر خۆشیی کوڕی خۆت دەوێ،ڕێم پێبدە تا پێوەندیی بە (ئـەوین) بکـەم و بڵـێم زوو وەرەوە تـا زەماوەنـد سـازبکەین و بـبین بـە هاوسەر.

سەری ماچکردم، گوتی: هەمیشە خۆشیی تۆم مەبەستە، هەر ئێستە تێلێفۆنی بۆ بکە.

دەسەکانیم ماچکرد،زۆر سوپاسم کرد،بە مۆبایلەکەم ژمارەکەم لێدا و بڵندگۆی دەرەکی مۆبایلەکەم کردەوە،گوتم: دایکە گیان، وەرە نزیکەوە، با تۆش گوێت لە دەنگی ئەوین بێ.

گوتی: ئەلو.

گوتم: مەڵێ ئەلو، بڵێ....... بەڵێ.

گوتی: بەڵێ، کاك بڕیار گیان ،خۆتی؟!!.

گوتم: نەخێر (کاك بڕیار) نییم، (بڕیار)م.

گوتی:بڕیار گیان، بە خێر بێیتەوە،چۆنی، دایکت چۆنە؟.

گوتم: سوپاس ئەوین گیان، تۆ چۆنی؟.

گـوتی: ئێـستە باشـم چـونکە لەگـەڵ براکـەم دەژیـم، بـەڵام ئەوەنـدەی لەگەڵ ئەو دڵ پیسەبووم، زۆر خراپبووم.

گوتم: هاوبەشی خەمەکانتم، بە تایبەت کۆچی دوایی دایکت.

گوتی: سوپاس، دایکم بە هۆی منەوە گیانی پاکی سپارد.

گـوتم:هیـوادارم خـوا بـە بەهەشـتی شـادبکات، پێمبڵـێ، بـە نیـازی هاتنەوە نییت؟.

گوتی:تۆ چیی دەڵێی، بێمەوە یا نا؟.

گوتم: دەمەویَ بە زووترین کات بێیتەوە، گەر ڕازیبی، دەتکەم بە خۆشەویسترین هاوسەرم، دڵنیابە، هیوای دووەمی ژیانم، تۆی و هەر تۆ دەبی.

قسەی باش بۆ نەدەکرا، گریان قورگی گرتبوو، بە دەنگیَ نەوی، گوتی:لە ژیانمدا تەنیا هەر تۆم خۆشویستووە،بەڵام چیی لە برا و دایك بکەم،بە هەندەرانیان فرۆشتم.

گوتم: ئێستەش هیچ نەبووە، سبەینیَ ئێواریَ من و دایکم بۆ ماڵی (هەرێم)ی برات دەچین، سەرەخۆشیی لێدەکەین بە هۆی مردنی دایکت و پیرۆزبایی لێدەکەین بە بۆنەی ژن هێنانییەوە، پاشان داخوازیی تۆی لێدەکەم،بەڵام پێش چوونی ئێمە،حەزدەکەم خۆتیش پێوەندیی پێوە بکەی، بڵێی، ئەمجارە خۆم دواڕۆژم هەڵدەبژێرم.

گوتی: بە دڵنیاییەوە، یا بۆ تۆ دەبم، یا بۆ ژێر گڵ.

دایکم چاوەکانی سوور ببوون لە گریان، گوتم: ئەوین گیان دایکم وا بۆت دەگری.

گوتی: دەسەکانی ماچ دەکەم، توخوا بڕیار گیان بیدەرە دەسی با دوو قسەی لەگەڵ بکەم.

دایکم،چاوەکانی سڕییەوە و هەناسەیەکی بە ئارامیی هەڵکێشا و مۆبایلەکەی وەرگرت،گوتی: کچەکەم چۆنی، بە قوربان.

ئەوین گوتی: زۆر باشم دایەگیان، هیوام خۆشییتانە.

دایکم گوتی: خۆشیی ئێمە بە تۆوەیە کە ببی بە بووکی ماڵم و هەمیشە لە خزمەتیی تۆ و بڕیار و منداڵەکانتان بم.

ئەوین گوتی: دایکە گیان، دەسەکانت ماچ دەکەم، بڕوا ناکەم ئەوڕۆ ئەم هەواڵە دەبیستم،(بڕیار) داوای هاوسەربوونیم لێدەکات و تۆش

حەزدەکەی بە بووکت بم، پێویستە هەردەم، ئێمە لە خزمەتیی تۆ بین، من دایکم نەماوە، تۆ لە جێی دایکمی.

پتر نەیتوانی بەردەوام بێ لە قسە کردن، گریا.

دایکم گوتی:کچەکەم مەگری، دڵی خۆت تەنگ مەکە،توخوا ئاگاداریی خۆت بە،لە ڕێگەوبان، لە نەخۆشیی،زۆر ئاگاداربە بووکە جوانەکەم، بە براکانتیش بڵێ، با ڕۆژێ زووتر بێیتەوە، ماڵمان ئاوەدانکەیتەوە.

مۆبایلەکەم لە دایکم وەرگرت، گوتم: ئەوین گیان.

لوشمەی گریانی دەهات و بە هێمنی ، گوتی: بەڵێ.

گوتم: دڵی خۆت ئازارمەدە،ئەوڕۆ خۆشترین ڕۆژمە، ئاواتی دووەمی ژیانم دێتە دی.

گوتی: سوپاس بڕیارگیان،بیرم چوو پیرۆزبایی و دەستخۆشکەریت لێبکەم بە بۆنەی هێنانەوەی ئەو کچە ئەنفالانە.

گوتم:سوپاس ئەوین گیان،دەمەوێ کە سبەینێ دەچمە لای (هەرێم)ی برات بۆ خوازبێنی ،قسەت لەگەڵدا کردبێ.

گوتی:دڵنیابە بڕیارگیان،چەن کاژێرێکی دی تەلەفۆنت بۆ دەکەمەوە.

گوتم:کەواتە، با لە کاتت نەگرم، بە خوات دەسپێرم، دایکم دەمی هێنایە نزیک مۆبایلەکەوە و گوتی: کچی شیرینم ئاگاداریی خۆت بە.

گوتی:سوپاستان دەکەم، لە ئەوڕۆوە زۆر ئاگاداریی خۆم دەبم، چونکە وا دەزانم ئەوڕۆ لە دایک بوومە کە لەمەولا ژیانم لەگەڵ ئێوە بە سەر دەبەم.منیش بە خواتان دەسپێرم، ماڵاوا.

## (٢١)

شەو لە چاوەڕوانیی پێوەندیی کردنی ئەوین بووم، هێند دڵخۆش بووم،نەمدەزانی چۆن ئەو خۆشییە دەربڕم،حەزمدەکرد چ هەستونەستی ناخم هەیە، بیکەمە سەر پەڕاوێ، ئەو خۆشییە وای لێکردم چەن جارێ ووشەکانم دەنووسی و دووبارەم دەکردەوە تا هۆنراوەیێ ناسک لە دایک بێ.خۆم ئامادە کرد،هەرکاتێ ئەوین پێوەندیی پێوە کردم،هۆنراوەکەم بکەمە جوانترین دیاری و بۆی بخوێنمەوە.

لە کاژێر ١٠ی شەو بوو،هێشتا بادەکەم زۆری تێمابوو، زەنگی مۆبایلەکەم لێیدا،نوسرابوو (ئەوین)، یەکسەر هەڵمگرت، گوتم: ئەی جوانترین پەری خەیاڵم، شەوت شاد.

گوتی: سوپاس بڕیار گیان، شەوی تۆ و دایە شاد.

گوتم: زۆر چاوەڕوانت بووم، تا مژدەم پێبدەی.

گوتی: بڕیار گیان، براکانم زۆر خۆشحاڵن بۆ یەکدیبین،

هەوراز ی برام دەڵێ،هەر کاتێ ویستت بڕۆیتەوە، لە ماوەی هەفتەیەکدا بە فڕۆکە بۆ کوردستان دەتنێرمەوە .

گوتم: کەواتە سبەینێ من و دایکم بۆ ماڵ هەرێم ی برات بچین؟

بە هێمنی و بە دەنگێکی نەوی گوتی: بەڵێ.

گوتم:ئەمشەو لە خۆشەویستیی تۆ، هۆنراوەیێ لە ناخی دڵمەوە لە دایك بووە،دەمەوێ بیخوێنمەوە و بیکەمە دیاریی بۆ تۆی خۆشەویست.

**گوتی: هۆنراوەش دەزانی بنووسی ؟**

**گـوتم:خۆشەویـستیی تـۆ وایلێکردووم،بتـوانم هـۆنراوە بنووسـم. ناونیشانی هۆنراوەکەش (جێم مەهێڵە).**

**گوتی:بڕیار گیان بۆم بخوێنەوە.**

**گوتم:تۆش خامەکەت بە دەسەوە بگرە،تا بینووسیتەوە.**

**گوتی:فەرموو گیانەکەم ئامادەم.**

**گوتم:.........................جێم مەهێڵە**

**بینینی یەکەم ڕۆژی چاوپێکەوتنت دڵمی ........ داخوریان**

**تیشکی چاوی تۆ بوونە تیر،لە نێو دڵمدا خۆیان ......داچەقان**

**بەیانی فەرمانگە و دانیشتنت بەرانبەرم جەستەمی.. ئەورووژان**

**خەیاڵ ئەیبردمەوە گیانە، چاوەکانم ............. نەئەپروکان**

**نازانم دڵی من وابوو یا گڕی عیشق تۆیشی ......... ئەکڕوزان**

**نەتئەزانی قژی خاوت،چاوی کاڵت چییان ........لێم ئەستان؟!!**

**نەتئەزانی گەردنی سپیی و لێوی ئاڵت چییان .....دائەمرکان؟!!**

**پێم ئەڵێی ئەڕۆم و جێتەهێڵم و ئەچم بۆ .......... هەندەران**

**دەبا ئاشکرایکەم تۆ چەن خۆشەویستیی ...........ئەوین گیان**

**مەڕۆ جێم مەهێڵە ڕۆژانە تۆ دڵ و چاومت ........... ...ئەگریان**

**تەنیا جێم مەهێڵە با شادبین بە کەژاوەی ......هاوسەرێتیمان**

**گوتم: ئەوین گیان،بۆچیی بێدەنگ بووی؟.**

**گـوتی:دەسـخۆش،هۆنراوەییێ بـە هێزە،ڕۆژانـی فەرمانگـەی هێنایـەوە یادم.بەڵام ئاخ چییم کرد بە خۆم، چۆن بەو چاوچنۆك و دڵپیسە ڕازیـی بووم.**

گوتم: پێویست ناکا "کای کۆن بە با بکەی". گرنگ ئەوەیە سبەینێ بۆ داخوازیت دەچم، تۆش دەبێ لەم هەفتەیە بگەیتەوە کوردستان.

گوتی:سوپاس خۆشەویستم،چییت بوێ لە دونیا،دەیکەمە سەر چاوانم.

گوتم:گوڵەکەم، تۆ ئەو هەناسەیەی بێ وی ناتوانم بژیم،حەز ناکەم ئەو دەنگە ناسکەت لە گوێمدا کۆتایی بێ،بەڵام دەمەوێ ئەم هەواڵە خۆشەی کە زۆر لە مێژە دایکم چاوەڕوانییەتی،پێیڕاگەیەنم، تۆش بە هەورازی برات بڵێی هەر لە سبەینێوە مامەڵەی گەڕانەوەت بۆ کوردستان دەستپێبکات.شەوت شاد.

گوتی:شەوی تۆ و دایە شاد، گیانەکەم، بە خواتان دەسپێرم.

بە پەلە بۆ ژوورەکەی دایکم چووم،گوتم: دایکە گیان دەزانی هەر سبەینێ دەبێ بۆ خوازبێنی ئەوین بچین،چونکە براکانی ڕازییبوون.

دایکم لە مێژبوو خۆشیی وای بە خۆوە نەبینیبوو،هەڵهەڵەیەکی لێدا و پیرۆزبایی لێکردم،ئامێزی گرتەوە، منیش وەك منداڵیی،خۆم خستە باوەشی و گوشیمە خۆم، گریانی خۆشی لە چاوانی دەباری،پاشان دەسی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و گوتی:خوایە گیان سوپاس بۆ تۆ، کە ئەوڕۆت پێشاندایین.

## (٢٢)

سات بە سات و ڕۆژ بە ڕۆژ، لێشاوی خۆشیی ڕووی تێدەکردم، بە تایبەت ئەو ڕۆژەی بۆ ماڵی (هەرێم) چووین،وامدەزانی خەونە و دەیبینم. لە ژووری فەرمانگە دانیشتبووم وبیرم لە قسەکەی (هەرێم) دەکردەوە ،کە دەیگوت "من و هەورازی برام و دایکی ڕەحمەتیم" بەرانبەر (ئەوین) تاوانبارین،ئەو گوڵە پاکوبێگەردەمان بە دەسی چاوچنۆکێ هەڵوەران.

منیش گوتم: ئەو گوڵەی تۆ دەیڵێی، هەر پاکوبێگەردە و گەر ئێوە ڕازیبن،زۆرخۆشحاڵ دەبم بیکەم بە هاوسەری خۆم.

گوتی:ئەو گوڵە پیرۆزیی تۆ بێ، هیوادارم خۆشترین ژیان لەگەڵ یەکدی بە سەر بەرن.

لەو کاتەدا تریفەخان هاتە ژوورەوە گوتی: بەیانیت باش.

گوتم: ژیانت باش،خوشکە بەڕێزەکەم.

گوتی: کاک بڕیار، کەی شەکراو خواردنەوەی ئەوینە؟

گوتم:سبەینێ ئەوین لە کاژێر ٨ی بەیانی،لە سویدەوە بەرەو کوردستان دێ.

گوتی:من و براکەمیش دێین بۆ پێشوازیی ئەوین.

گوتم: سوپاستاندەکەم،بە نیازم تەنیا خۆم و ئۆتۆمبیلە خنجیلەکەم بۆ پێشوازیی بچین.

گوتی: کەواتە سبەینێ مۆڵەت وەردەگری.

گوتم:تا نزیک نیوەڕۆ دەوام دەکەم، پاشان بەرەو بازاڕ دەچم، بۆ کڕینی جوانترین دیاری، هەر لەوێوە بۆ فڕۆکەخانە دەچم و چاوەڕوان دەبم.

بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: خوا لێکتان نەکات، هیوام خۆشییتانە.

## (٢٣)

ئەو بەیانییە زۆر خەریکی خۆم بووم، هەر ئەوەندە نەبوو ئاوێنەکە بە وەلام بیَ، دەمویست بە جوانترین شێوە (ئەوین) بمبینیَ. هەر جاری قاتێکم لەبەر دەکرد و دەمگۆڕی. کە چوومە فەرمانگە، تەماشایان دەکرد و پیرۆزباییان لێدەکردم بۆ ئەو خۆگۆڕین و خۆشییەی بە ڕوومەوە دیاربوو.

تریفەخان هاتە ژوورەوە گوتی: کەی بۆ پێشوازیی ئەوین دەڕۆی؟.

تەماشای کاژێرم کرد و گوتم: نیو کاژێری دیکە دەردەچم.

(تریفە خان) گوتی: زۆر باشە، هیوام خۆشیتانە،جاریَ خوا حافیز.

سەرمسوڕما ئەم پرسیارەی کرد و بە پەلە چووە دەرەوە،ترسام "ڕیسەکەم لێبکا بە خوری" بچیَ بۆ پێشوازیی ئەوین،چونکە ئەویش (ئەوین)ی زۆر خۆشدەویَ.

لە پاش نیو کاژێر، مۆڵەتم وەرگرت بە ئۆتۆمبیلە خنجیلەکەم، بۆ بازاڕ چووم، ملوانکیَ زێڕم کڕی، کە پێکهاتبوو لە زنجیرێك و دوو دڵی تێکەڵ،خستمە گیرفانی چاکەتەکەم ،ویستم بچم نان بخۆم بەلام گوتم:ناچم و دەمەویَ بۆ یەکەمجار لەگەڵ (ئەوین) لە نایابترین چێشتخانەی شارەکەمان پێکەوە نان بخۆین.

بە پەلە بەرەو فڕۆکەخانە ڕۆیشتم.

له چاوەڕوانییدا بووم، تا پاش نیوەڕۆییێ درەنگ،لە بڵندگۆی هۆڵی چـــاوەڕوانی،ئاگاداریکردینەوە،فڕۆکەی ســـوید لـــە ئاسمـــانی کوردستاندایە، پاش کەمێکی دی دەگاتە فڕۆکەخانە.نەمتوانی دانیشم، کەوتمە پیاسە کردن، لە نێو هۆڵەکە دەخولامەوە و جاروبار تەماشای کاژێرەکەم دەکرد،خولەك بە خولەك هەژماردەم دەکرد،کە گوێم لە دەنگی فڕۆکـە بـوو، بـە پەلـە چـوومە لای پەنجەرەکـەوە، تەماشـای ئاسمـانم دەکـرد.هێـدی هێـدی دەنگەکـە زیـادی کرد،فڕۆکەکـە دەرکـەوت، تـا نیـشتەوە هـەر تەماشـام دەکـرد، بـە پەیـڕەی تایبـەت ،سەرنـشینەکان دادەبەزین.

سـەرنجی یەکـە بـە یەکـەی سەرنـشینەکانم دەدا، لـە پڕێکـدا ئـەوین دەرکەوت، هێند جوان ببوو، کورد ووتەنی"لەگەڵ مانگدا شەڕی دەکرد" نەمدەزانی لە خۆشییدا چیبکەم ،هاوار بکەم، ڕابکەم ، یا بوەستم تا خـۆی دەگـات.ئـەویش چاوە گەشـەکانی دەگێڕا، چاوشـارکێمان لەگـەڵ یەکـدی دەکرد،حـەزم نـەدەکرد چـاوەکانی مانـدووبێ، نەمدەویـست بێئومێدیی بیگرێ کە ئامادەی پێشوازیی نییم، هەر بۆیە بە دەنگێ بەرز گوتم:ئەوین گیان.

کـە بینیمـی ،دەسـی بـەرزکردەوە،وازی لـە جانتاکـەی هێنـا، بـە پەلـە هەنگاوی دەنا،ویستم لە وەستان بەردەوام بم، بەڵام نـەمتوانی، بە پەلـە بەرەو لای دەڕۆیشتم، گەیشتینە بەرانبەر یەکدی،چاوەکانی بە فرمێسك گەشـتر ببـوون، سـۆزی خۆشەویـستییمان لـە بـۆ یەکـدی، باوەشـی پێکردینەوە،لە ئامێزی یەکدیا بووین، دەسـی ئاسکیی توند لە پشتم گیرکردبوو،ڕوومەتی لە سەر سینگم بوو، ئەشکی دەبارانە سەر سینگم،

تەزووی خۆشەویستیی و سۆز،شەرمی نەهێشتبووین،کەمێ بە ئاگا هاتمەوە گوتم: ئەوین گیان، خەڵکی تەماشامان دەکەن.

گوتی: زۆر لە مێژە تامەزرۆی تۆ و کوردستانم.

خۆمان لە ئامێزی یەکدیا کردەوە،دەسم خستە گیرفانم، ملوانکەکەم دەرهێنا و گوتم: ئەوین گیان، بڕیارمداوە ئەم ملوانکەیە لە فڕۆکەخانە بکەمە گەردنی سپیی و ناسکت، تا ببێتە یادگارێکی هەمیشە زیندوی نێوانمان. کردمە ملی و پیرۆزباییم لێکرد و دوو ماچی ڕوومەتەکانیم کرد،ڕەنگی ئاڵ وجوانی لە شەرمدا،سووربووەوە،خۆشیی لە ڕوویدا دەباری.

گوتم:با جانتاکەت بێنم و بەرەو ماڵ بچینەوە.دەسێکم بە جانتاکەوە و دەسەکەی دیکەم لە ملی بوو،ئەویش نێو قەدی گرتبووم، ختوکەی بە لەشمدا دەهێنا و خۆشییەکی بێوێنەی پێبەخشیبووم.

گەیشتینە نزیک ئۆتۆمبیلەکەم گوتی:بڕیارگیان،ئەم ئۆتۆمبیلە خنجیلەت هەر ماوە، لە ئەورووپا کە هاوشێوەی ئۆتۆمبیلەکەتم دەبینی گەشدەبوومەوە.نەکەی بیفرۆشی، کاتێ بەیانیان بۆ فەرمانگە دەهاتم، چاوم دەگێڕا،گەر ئۆتۆمبیلەکەت لەوێ بوایە، ئەو ڕۆژە زۆر دڵخۆش دەبووم.

گوتم:لە ئێستەوە ئەو ئۆتۆمبیلەت پێشکەشبێ ،مۆڵەتی شوفێریت بۆ دەردەهێنم، هەر تۆ شوفێری بە.

سوار بووین و ڕوو لە نێو شار دەڕۆیشتین.

گوتم: پێمبڵێ، ئیستە بۆ کوێ بچین؟.

گوتی: بۆ کوێ دەچیی، ئارەزووی خۆتە.

گوتم: دەزانی تا ئێستە نان نیوەڕۆم نەخواردووە.

گوتی: منیش نەمخواردووە.

گوتم:کەواتە، بۆ چێشتخانە دەچین و لە پاشان دەچینەوە بۆ ماڵی ئێمە تا دایکمیش بتبینیٚ، ئینجا بۆ ماڵی (هەرێم)ی برات.

بە زەردەخەنەیەکی زۆر جوان،پێیگوتم: گیانەکەم ئارەزووی خۆتە.

لە پاش نانخواردن ،گوتم: ئەوین گیان، کەی بتوانم بتگوازمەوە؟.

ئەوین گوتی: ئارەزووی تۆیە.

گوتم: حەزدەکەم تۆش خاوەنی بڕیاربی و هەموو شتیٚ بە دەس من نەبیٚ تا ڕێی پیاو سالاری خۆشبکەی.

گوتی:گەر بە ویستی من بیٚ، هەفتەییٚ دیکە.

گوتم:زۆر ترسام بڵێی چەن مانگێکی دی،ئەو کات نەمدەتوانی دڵت بشکێنم.ئینشەڵڵا هەفتەیەکی دی ئەم کاتە،لە کەژاوەی هاوسەرێتییداین.

کە چووین بۆ ماڵ ،دایکم (ئەوین)ی لە ئامێز گرت، گەر خوشکەکانیشم بهاتنایەوە، هەر هێندە دڵی دەکرایەوە و لە باوەشی دەکردن،ئەوین دڵی زۆر بە من و دایکم دەکرایەوە و دەیگوت: تەنیا مەگەر ئێوە ژیانی من خۆشبکەن، چونکە لەم دونیایە، دڵم تەنیا بە ئێوە دەکرێتەوە.

نزیك ڕۆژاوابوون بوو،دایکم گوتی:کوڕەکەم، وا جوانترە بیگەیەنیەوە لای ماڵی براکەی،ئێستە ئەوانیش لە چاوەڕوانییدان.

گەیاندمە پێش دەرگای ماڵی خۆیان، زۆر گریا، هەستی دەکرد دایکی وونە و نایبینێتەوە بۆ تا هەتایی، لە دەرگامدا، (هەرێم) دەرگای کردەوە و باوەشیان لە یەکدا، فرمێسکیان بە لێزمە دەباری،سۆز و بەزەییم بۆ دیمەنی ئەوین،ئەشکی لە چاوان بارانم.

تریفەخان و براکەی هاتنە ژوورەوە لەگەڵ تریفەخانیش بە گریانەوە دەسیان لەملی یەکدی کرد،کامێراییێکیش بە دەس براکەیەوە بوو، وێنەی دەگرتین.

هەموو لە ژوورەوە دانیشتبووین،(ئەوین)ش هەر دەگریا،نەیدەتوانی بێدەنگبێ،کە وێنەی خۆی و دایکی بە گەورەیی لە سەر دیواری ژوورەکە بینی،بە پەلە چوو دایگرت و بە سەر وێنەکەوە دەگریا.

زۆر دڵنەواییمان دەکرد،بەڵام بێسوودبوو، ناهەقیشی نەبوو، چونکە دایك زۆر خۆشەویستە.

گوتی: کاکە هەرێم دەمەویٚ سبەینیٚ بۆ سەر گۆڕەکەی دایکم بچین.

گوتم:خەمت نەبیٚ ئەوین گیان، سبەینیٚ هەموو پێکەوە دەچین.

لە پاش چەن کاژێریٚ لە نێو ئەو دیمەنە دڵتەزێنە، تریفەخان گوتی: ئەوین گیان هاتنەوەت،خۆشیی خستە نێو دڵمانەوە، بە تایبەت بۆ (کاك بڕیار).

شەرم و بزەییٚ زۆر جوان لە سەر لێوانی دروسبوو، گوتی:ئێوە خۆشەویستیی منن، هەمیشە دووریتان ئازار و نامۆیی پێبەخشیبووم.

تریفە گوتی: من و براکەم مزگێنییمان پێیە.

گوتم: تریفەخان چییە بێڵیٚ، هەردەم تۆ مژدە بەخش بووی.

گوتی: یارمەتیی هەیە تێلیڤزیۆنەکە بەکار بێنم.

هەرێم گوتی: بە سەرچاو، خوا دەکات دڵی (ئەوین)، هێور دەبێتەوە.

(لەو کاتەی کە لە فەرمانگەوە دەرچووم، بەرەو بازاڕ بۆ کڕینی ملوانکە، پاشان فڕۆکەخانە، چێشتخانە ، ماڵی ئێمە و ماڵی ئەوینیش) تریفەخان لەگەڵ براکەی،زۆر بە نهێنیی بە دوامانەوە بوون، بە کامێراکە وێنەیان گرتبووین.

پاش بینینی ئەو فیلمە،من و ئەوین زۆر شەرممان دەکرد، نەماندەزانی چیی بلێین.

گوتم:تریفەخان، کە هاتیە ژوورەکەم و گوتت کەی دەچی بۆ پێشوازیی (ئەوین)،منیش گوتم: نیو کاژێری دی. تۆش بە پەلە خوا حافیزییت لێکردم و چوویتە دەرەوە، سەرمسوڕما ، وامدەزانی لە پێش من بۆ پێشوازیی ئەوین دەچن،بەلام نەمدەزانی ئەم کارە ئەنجامدەدەن.

تریفە گوتی:چوومە دەرەوە و تێلیفۆنم بۆ براکەم کرد تا کامێراکەی و ئۆتۆمبیلەکەی بێنیْ ،چونکە شەویْ ئەم بریارەمان دابوو.

(ئەوین) گوتی: سوپاستان دەکەم، خوشکی دڵسۆزیی منی.

تریفە پێیگوتم: کەی ئاهەنگی گواستنەوە سازدەکەن؟

گوتم: کاك هەرێم دەزانیْ.

هەرێم گوتی: ئارەزووی خۆتانە، هەر کاتیْ دیاریدەکەن.

تەماشای (ئەوین)م کرد، بە دەنگیْ نەوی گوتم: هەر هەفتەییْ بیْ، یا دووهەفتەی دیکە،چاوە گەشەکانی کردەوە ،بە خەندەییْ زۆر جوان و بە هێمنی پێیگوتم: هەفتەییْ بیْ، کەمیْ دەنگی بەرزکردەوە و گوتی دەمەویْ چەن ڕۆژیْ لەگەڵ ماڵی براکەم بمێنمەوە.

گوتم:زۆر چاکە،دەمەویْ بڕۆمەوە، چونکە دایکم ئێستە هەر چاوەڕوانمە.

براکەی تریفە گوتی: خوشکە گیان، ئێمەش با بڕۆین.

ئەوین توند دەس تریفەی گرت، گوتی: ئەمشەو تریفە لای من دەمێنێتەوە.

براکەی تریفە گوتی: چۆنتان پێخۆشە با وابیْ.

گوتم:(کاك هەرێم)، دەتوانی دوو سبەی لەگەڵ ئەوین بۆ دادگا بێی، تا (ئەوین) لە دادگا مارەبکەم.

گوتی: بە چاوان، ئەوین چیی بڵێ من ئامادەم .

سوپاســـم کـــردن،من و براکـــەی تریفـــە، بـــە ئۆتۆمبیلـــەکانمان ڕۆیشتینەوەو ئەوانمان جێهێشت.

## (٢٤)

بەیانی بوو، وەك كاری ئاسایی ڕۆژانە، هەر شەش كچەكە پێوەندییان پێوەكردم.گەر ڕۆژێ،یەكیان پێوەندیی پێوە نەكردمایە،خۆم پێوەندییم پێوەدەكرد.ئەو بەیانییە شیلان گوتی: كاكە گیان خەوم بە تۆ و دایەوە بینیووە،خۆ هیچ نەبووە؟.

گوتم:خەونەكەت ڕاستە،چونكە من و دایە هیچ كات، هێند دڵخۆش نەبووینە.

گوتی: كاكە با ئێمەش لەو خۆشییە بەشداربین.

گوتم:دڵنیابە، سێ ڕۆژ دیكە دەبێ بۆ ماڵی ئێمە بێن و چەن ڕۆژێ بمێننەوە،چونكە ژنم مارە كردووە،پێویستە هەر شەش خوشكەكەم لە ماڵ بن.

گوتی:كاكە گیان، هەواڵێ زۆر خۆشت پێدام، پیرۆزباییت لێدەكەم، هەر ئێستە تێلێفۆن بۆ كچەكان دەكەم، تا ئەم هەواڵەیان پێڕاگەیەنم و بە زووترین كات ئامادەبن.

گوتم: سوپاس شیلان گیان،بەوانیشم گوتووە. بەلآم پێمبڵێ نەخشەی خانووەكەتان بە دڵە، یا نا؟.

گوتی:زۆرجوانە، دەستخۆشبێ،دەسی كاك (هیوا)ش خۆشبێ، چونكە بە ڕاستی بە كارەكانمانەوە زۆر ماندووە.

گوتم: ئەوە ئەركی سەر شانمانە.

**گوتی: سوپاس کاکە گیان، با لە کاتت نەگرم.تا بە زوویی پێوەندیی بە کچەکانەوە بکەم، کە خۆمان ئامادە بکەین.**

**گوتم: سوپاس بە خواتان دەسپێرم.**

**دەسم دایە خامەکەم و داوای پازدە ڕۆژ مۆڵەتم کرد، بۆ ژن هێنان.**

## (٢٥)

ڕۆژی شەکراو خواردنەوە، بانگێشتی زۆر کەسمان کردبوو، تەنانەت وەزیریش هاتبوو. (هیوا) و براکەی تریفە خان، لە خزمەتی شەکراو خواردنەوەی پیاوان بوون. شیلان و تریفە خان و پێنج کچەکەی دی، لە خزمەتی شەکراو خواردنەوەی ژنان بوون.

دوو ڕۆژ دوای شەکراو خواردنەوەکە ئاهەنگمان سازکرد، لە نایابترین ئوتێلی شارەکەمان و لە سەر بودجەی وەزارەتی مافیی مرۆڤ ، مانگی هەنگوینیمان ئەنجامدا کە خۆشترین شەوانی ژیانم بوو. هیچ پێوەرێ نەبوو، ئەو خۆشیی و خۆشەویستییەی من و ئەوین بپێوێ!!.

شەوێکیان ئەوین گوتی: گەر منداڵمان بوو،چیی ناو بنێین؟.

گوتم: بە ئارەزووی تۆ.

گوتی: گەر کوڕ بوو ناوی دەنێم (هەنگاو).

گوتم: گەر کچیش بوو ، ناوی دەنێم (ئالاّ).

لە پاش چەن ڕۆژی نێو کەژاوەی هاوسەرێتیی، گەڕاینەوە باوەشی دایکم، ئەویش هەمیشە نزای بۆ دەکردین کە خوا لێکمان نەکات و بمانپارێزێ.

## (٢٦)

پاش پازده ڕۆژ مۆڵەت، یەکەم ڕۆژی دەس بە کاربوونەوەم بوو، فەرمانبەران پیرۆزباییان لێدەکردم، لە پڕ لە لایەن بەڕێوەبەری گشتییەوە تێلیفۆنم بۆ کرا، گوتی: پیرۆزە، دوو جار پیرۆز.

گوتم: سوپاس، بەلام بۆ دوو جار پیرۆز؟.

گوتی: پیرۆزبایی یەکەم بە بۆنەی ژن هێنانەوە،دووەم پیرۆزبایی، بە نووسراوی فەرمی لە وەزارەتی مافیی مرۆڤەوە،بڕیاردرا ، ببی بە بەڕێوەبەری گشتیی فەرمانگەکە.

گوتم: لەبەر جەنابت حەز ناکەم.

گوتی: من دەچمە وەزارەت و تۆش دێیتە جێی من.

گوتم:سوپاست دەکەم،خۆشترین هەواڵت پێدام، بەلام کێیان لە شوێنەکەی من داناوە؟

گوتی: هیوا، دێتە شوێنەکەت، چونکە کاتێ بۆ (میسر) چووی، سەرکەوتووانە لە شوێنی تۆ کارەکانی ئەنجامدەدا.لەبەر ئەوە هەر ئێستە لەگەڵ (هیوا) تاوتوێی کاروبارەکانی ژوورەکەت و وەرگرتنی ژوورەکەت بە فەرمی واژۆی دەکەن،پاشان وەرە بۆ ژوورەکەم تا منیش ژوورەکەت پێشکەش بکەم.

دووبارە سوپاسم کرد.

یەکسەر تێلیفۆنم بۆ ئەوین و دایکم کرد ، ئەم هەواڵە خۆشەم پێڕاگەیاندن، هەر بە پەلە دامخست و بانگی (هیوا)م کرد، دڵی ئەویشم خۆشکرد کە دێتە شوێنەکەم.

هەر بۆ دووەم ڕۆژ و دەست بەکار بوونم، وەك بەڕێوەبەری گشتیی، شیرینیم بە سەر فەرمانگەکە دابەشکرد.

یەکەمین کۆبوونەوەم ئەنجامدا، داوام کرد ،بە زووترین کات خانووی کچانی ئەنفال تەواو بێ و مووچەکانیان لە کاتی خۆی پێبدرێ، پەیکەرەکەش لە کاتی دیاریکراوی خۆی تەواو بێ،لەمانەش گرنگتر لیژنەی بە دواداچوونی (١٨) کچی ئەنفال لە (میسر) کارەکانی خۆیان زوو ئەنجامدەن.

فەرمانی گەڕانەوەی ئەوینم بۆ سەر کاری پێشووی دەرکرد.

## (٢٧)

لـه پـاش دوو مـانگ کـارکردن، دروسـکردنی خانووەکـان تـەواو بـوو، بەڵێندەر کلیلی خانووەکانی بۆ هێنایـن.

ئێمـــەش کلیلـــەکانمان بـــە شـــێوەیەکی شایەســـتە،بە خوشـــکەکانم بەخشی.

لـــە نزیـــك گونـــدی مـــاڵی شـــیلان..بـــەرزترین شـــوێنمان بـــۆ پەیکـــەری قارەمانیی کچانی ئەنفال دیاریکرد.

گوتم: بە هونەرمەندی شێوەکارەکە بڵێن، بـە زووتـرین کـات کارەکـەی ئەنجامدا،چـونکە ئێمـە دەمانـەوێ لـە سـاڵیادی ئـەنفال، پـەردە لـە سـەر پەیکەرەکە لابەرین.

## (٢٨)

پاش چەن مانگێ هیوا هاتە ژوورەکەم گوتی: ئەوڕۆ بۆ کارێکی تایبەت هاتووم ،پێوەندیی بە فەرمانگەوە نییە.

گوتم: فەرموو، هەر چییت هەیە بیڵێ.

گوتی:ئەو کچانە تۆیان زۆر خۆشدەوێ، هەموویان تۆ بە برای خۆیان دەزانن.

گوتم: بەڵێ، ئەوانە خوشکی منن.

گوتی:کەواتە من دەمەوێ داخوازیی شیلان بکەم،ئایا تۆ ڕازیی دەبی.

گوتم:زۆر سوپاس بۆ ئەم هەواڵە خۆشە، گەر ئەو ڕازیی بێ زۆرم پێخۆشە، بۆ ئەم مەبەستەش، هەر ئێستە تێلێفۆنێ بۆ دەکەم، بزانم چیی دەڵێ.

گوتی: من دەڕۆم، خۆت ئەم کارە ئەنجامدە.

یەکسەر بانگی (تریفە و ئەوین)م کرد، وەك دوو فەرمانبەر هاتنە ژوورەوە، گوتیان فەرموو.

گوتم: فەرموو دانیشن.

تریفە گوتی: فەرموو کاك بڕیار چییت دەویست؟

گوتم: دەمەوێ کارێکی مرۆڤانە ئەنجامدەین، کە ئەویش خوازبێنی (شیلان)ە بۆ هیوا،ویستم پێوەبکەم،بەڵام گوتم: نەوەکو شەرم بکات. با به تریفەخان وئەوین بڵێم،جا نازانم ئێوە ڕاتان چییە؟.

ئەوین گوتی: سبەینێ هەینییە، بۆ ماڵی شیلان دەچین،شەویش دەمێنینەوە و گەر خۆی ڕازیی بوو، هەر لەوێ لە خاڵۆی داخوازی دەکەین.

گوتم: بۆچوونێکی زۆر چاکە،دوو هەفتەش دەبێ نەچووینە،بەڵام دەمەوێ ئەمجارە تریفەخان و براکەیشی بێن.

تریفە گوتی: بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە.

گوتم: ئێوە بڕۆن بۆ شوێنی خۆتان و بانگی (هیوا)م بۆ بکەن.

بە پەلە هاتە ژوورەوە و گوتی: کاك (بڕیار) چییت کرد.

گوتم: بە نیازین سبەینێ، ئێمە و ماڵی تریفەخان بچین بۆ ماڵی شیلان و لە خاڵۆکەی خوازبێنی بکەین.بەڵام تۆ لەگەڵ شیلان هیچ لەو بارەیەوە قسەتان کردووە؟

گوتی:لە ڕۆژی ئاهەنگەکە بە (شیلان)م گوت:گەر بێم بۆ خوازبێنیت ڕازیی دەبی؟

گوتی: جارێ ناتوانم، چونکە خانوەکەم جێناهێڵم.

گوتم: من بە هەموو مەرجێکت ڕازیی دەبم، گەر تۆ بڵێی شووت پێدەکەم.

گوتی: منیش لەو ڕۆژەی کە تۆم ناسیووە، زۆر حەزدەکەم لەگەڵ مرۆڤێکی وەك تۆ، ببم بە هاوسەر، بەڵام جارێ کەمێ چاوەڕوانبە. منیش پتر ناتوانم چاوەڕوانیی بکەم، هەر بۆیە گوتم با بە کاك بڕیار بڵێم.

گوتم:ئێمە سبەینێ ناوی خوای لێدێنین،دڵنیام هەر بە دڵی تۆش دەبێ.

گوتی: منیش چاوەڕوانیی وەڵامتانم، سوپاسی برایەتیت دەکەم.

گوتم:تۆ شایانی هەموو شتێکی ،لە ئێمەش پتر بە تەنگی ئەم کچانەوەی.

## (٢٩)

**لە پێش ماڵی شیلان وەستاین، بە پەلە لە خانووە دڵگیرەکەی هاتە دەرەوە،شانی ماچکردم،منیش سەرم ماچکرد، لەگەڵ ئەوین و تریفەخان باوەشیان لێکدا و گوتی: ئەوین لە سەربانەوە تەماشام دەکردن،زۆر بە جوانی ئۆتۆمبیلەکەت لێدەخوڕی.**

**گوتم: (ئەوین) ئێستە بووەتە خاوەن مۆڵەتی شوفێری و بەیانیانیش کە بۆ فەرمانگە دەچین،هەر ئەو ئۆتۆمبیلەکە لێدەخوڕێ.**

**شیلان گوتی:کاکە گیان خوا لێکتان نەکات،نمونەی خێزانی ئەم سەردەمەن.**

**کە ویستیان خواردن دروسکەن، تریفە و ئەوین گوتیان خواردنێکی زۆر باشمان لەگەڵ خۆماندا هێناوە.**

**گوتی: وا دیارە حەز بە خواردنی دەسی من ناکەن.**

**خاڵۆژنی شیلان گوتی: ڕۆڵەکانم، ماڵی خۆتانە بۆچیی خواردنتان هێناوە.**

**گوتم: دڵتان هیچ نەکات، جارێ دیکە خواردن ناهێنین، ئەم جارە بۆیە خواردنمان هێنا، تا شیلان بە ئامادەکردنی خواردنەوە خەریك نەبێ. چونکە کاری خێرمان بە دەسەوەیە.**

**گوتی: یا خوا بە خێربێن، ئێوە خۆتان خێر و بەرەکەتن.**

تەنیا من و(ڕێبوار)ی برای تریفە لەگەڵ خاڵۆی شیلان لە ژوورەکە ماینەوە، لەو کاتە ڕووم کردە خاڵۆی شیلان و گوتم: ئەمجارەیان بۆ داخوازی شیلان هاتووین.

گوتی:تۆ برای (شیلان)ی،لە من لە پێشتری،چییت پێباشە وابکە.

گوتم: سوپاس خاڵۆ گیان، هیوا کوڕی باشە و ئەو داوای لێکردین بێین بۆ داخوازی،بەڵام ئەوەی زۆر لام گرنگە، ڕازیی بوونی (شیلان)ە.

هەموو هاتنە ژوورەوە بەڵام شیلان شەرمی دەکرد،ڕەنگی شەرماویی لێنیشتبوو،چاوەکانی لێدەشاردمەوە،دیاربوو ئەوین و تریفە هۆی هاتنی ئەمجارەیان بۆ باسکردبوو.

گوتم:شیلان، بێ پێچوپەنا،بۆ داخوازییت هاتووین بۆ هیوا، خاڵۆتیش دەڵێ ئارەزووی خۆتانە ،ئیدی نازانم تۆ چیی دەڵێی؟ نەیدەزانی چیی بڵێ، هەموو چاوەکان تەماشای (شیلان)یان دەکرد، ئێجگاری شەرم دایگرتبوو.

گوتم: هەموو کەسی تۆین، بێشەرمکردن وەڵاممان بدەرەوە.

گوتی: هیوا جارێ پێیگووتووم، بە شەرمەوە بە زەردەخەنەیەکی شەرماوی کچانییەوە، گوتی: بە مەرجێ لە گوندەکەمان نەڕۆم.

گوتم:ئەو بە هەموو مەرجێ ڕازییە،پاشان گوندەکەتان لە شارەوە نزیکە.

ئەوین گوتی: کەواتە کارەکەمان بوو.

تریفە گوتی: بە ڕاستی هەردووکتان شایانی یەکدین، پیرۆزە.

گوتم: هەر ئێستە پێوەندیی بە(هیوا)وە دەکەم و ڕازیی بوونتی پێدەگەیەنم. بڵندگۆی دەرەکی مۆبایلەکەم کردەوە.گوتم:هیوا گیان دەزانی لە کوێوە قسەدەکەم؟.

گوتی: ئەی چۆن نازانم، لە ماڵی (شیلان)ەوە قسە دەکەی.

گوتم: (شیلان) ڕازییە، بەڵام هێندێ مەرجی هەیە.

گوتی: هەموو مەرجەکانی دەنێمە سەرچاوم.(شیلان)یش شەرم و بزە جوانەکەی،ڕووی گەشی جوانتر کردبوو، کە هەموو پێکەنین، هیوا گوتی:گوێم لە پێکەنینە. گوتم: بڵندگۆی دەرەکی مۆبایلەکەم کردووەتەوە،هەموو گوێیان لە دەنگتە.

گوتی: سوپاستان دەکەم، هیوادارم هەر لە پێکەنین و خۆشییدابن.

بەڵام دەمەوێ کاتی مارە کردن و سازکردنی ئاهەنگمان دیاریکەن.

مۆبایلەکەم دایە دەس (شیلان) گوتم:خۆت قسەی لەگەڵ بکە. ئارەقی شەرم بە گەردنیدا دەهاتە خوارێ،هەر بۆیە گوتم: شیلان، بڕۆ دەرەوە و بە ئارەزووی خۆتان قسەبکەن و کات دیاریکەن.

پاش کەمێ هاتە ژوورەوە و مۆبایلەکەی پێدامەوە و سوپاسی کردم.

گوتم: ڕێککەوتن؟

گوتی: بەڵێ.

گوتم:چۆن ڕێککەوتن؟.

گوتی:هەفتەیێ دیکە ،بۆ مارەکردنەکە بۆ دادگا دەچین، بە هەموو مەرجەکان ڕازیی بووە.جگە لەوەش ڕێککەوتین لە بەهاراندا بۆ گوندەکەمان بێینەوە،لە وەرزەکانی دی لە نێو شار لە خانووەکەی خۆیان دەبین،لە نهۆمی سەرەوە و براکەیشی لە نهۆمی خوارەوە دەبێ. بەڵام حەزمدەکرد دایك و باوکی بمایە و بە تایبەت دایکی تا نازی دایکێتی پێبدایەم.

هەموو پیرۆزباییمان لێکرد.

**لە پاش یەک مانگ (شیلان و هیوا)ش بە ئاهەنگێکی شایستە، چوونە کەژاوەی هاوسەرێتییان و لە ئوتێلێکی نایاب و لە سەر بودجەی وەزارەت، مانگی هەنگوینیان ئەنجامدا.**

## (۳۰)

چەن ڕۆژێکی مابوو بۆ ساڵیادی کارەساتی ئەنفال، هونەرمەندی شێوەکار،کارەکەی تەواو کردبوو، لە بەرزاییەکی نزیک گوندەکەی ماڵی شیلان،کە لە نێو جەرگەی دەڤەری بەرکەوتوو بە کارەساتی ئەنفال بوو، جێگیرکرا، بە پەردەیێ سپیی داپۆشرابوو.

لە ڕۆژی ساڵیادی کارەساتی ئەنفالی بەدناو، بە سەرپەرشتی وەزیری مافیی مرۆڤ ،پەردە لە سەر چوار وێنەی کچی قارەمان لە داستانی تۆڵە، دژ بە جەللادەکان، هەڵدرایەوە، کە پێیان لە سەر پشتی جەللادێ بوو، بە دەسەکانیان، مەشخەڵی سەرکەوتنیان بەرزکردبووەوە.

مەشخەڵەکەیان داگیرسان ، یەك خولەك بۆ گیانی پاکی شەهیدان وەستاین، لە پاشان وەزیری مافیی مرۆڤ چەن ووتەیەکی سەبارەت بە کارەساتی ئەنفال دەربڕی، گوتیشی پێویستە لە شێوەی ئەم پەیکەرە لە نێو شارەکانی کوردستان دروستبکرێ.(شیلان)یش وەك شایەتحاڵێ، باسی چۆنیەتیی ژیانی کچانی ئەنفالیکرد لە زیندانەکانی ڕژێمی دیکتاتۆریی سەدام ،پاشان سوپاسی وەزارەتی مافیی مرۆڤی کرد، بە تایبەتییش باسی ڕۆڵی منی کرد لە هێنانەوەیان، دواجار گوتی: دەبێ هەمووان سەری ڕێز و نەوازش بۆ شەهیدانی "هێزی گیانیی تۆڵەی کچان"دانەوێنین.زۆر سوپاسی کاك بڕیار بکەین کە وەك برایێ دڵسۆز، توانی ئێمە لە نێو دۆزەخی دوژمن ڕزگاربکات، هیوادارم لە وێنەی هەر

زۆر بێ لە کوردستانمان. ئێستەش حەزدەکەم، کاك بڕیار بێ و چەن وتەیێ بە نرختان پێشکەش بکات، دووبارە سوپاس.

کە هەستام بۆ پێشکەشکردنی وتەکەم، هەموو جەماوەر هەستانە سەرپێ، زۆر ڕێزیان لێگرتم، منیش سەری ڕێزم بۆ دانەواندن، ئیدی دەسمکرد بە وتەکەم و گوتم: سوپاستان دەکەم،پێویستە لە سەر هەمووان، ئەوڕۆ لە مێژووی گەلەکەمان، بەرز بنرخێنین، مەشخەڵی کچانی تۆڵەستێن داگیرسێنین،کە هێمای سەرکەوتنی قارەمانانەی کچانمانە دژ بە جەللاد و چاوچنۆك و داوێنپیسان.پێویستە لە سەر ئێمە پاڵەوانێتیی کچانمان بە نەوەی نوێ و داهاتوو بگەیەنین، تا ئەوانیش پیرۆزیی ئەم پەیکەرە لە یاد نەکەن.

دووبارە سوپاس بۆ هەمووان، کە لەم مەراسیمە شکۆدارە،بە چاوانی پڕ فرمێسك، بە گیانیی برایەتیی و تەبایی ئامادەبوون.

پاشان چەن سروودێکی نیشتمانیی پێشکەش کرا وکۆتایی بە مەراسیمەکە هات،هەموو ڕۆیشتن، تەنیا گڕی مەشخەڵەکە بڵێسەی دەدا.

(من و ئەوین) و (شیلان و هیوا) و هەر پێنج کچەکە، بۆ سەر مەزاری شەهید زارا چووین و وێنەی پەیکەرەکەمان لە کێلەکەی چەسپکرد.

شەوێ هەموو چووینە ماڵی شیلان و هیوا لە گوندەکەیان، کە نزیکبوو لە پەیکەرەکەوە.لە سەربانەکەیان دانیشتبووین،چەن شەو دەچووە قوڵایی تاریکییەوە گڕ و بڵێسەی مەشخەڵی کچانی تۆڵە ئەو دەڤەرە و ئاسۆی بڵندیی گەلەکەمانی ڕووناکتر دەکردەوە.

بە هیوام گوت:دەمەوێ ئێستە بە کامێراکە، وێنەی پەیکەرەکە بگری.

کامێراکــەی هێنا،تەماشــایکرد و گــوتی:زۆر باشــە، فیلمەکــە دە خولەکێکی ماوە،چونکە ئەوڕۆ بە چەندین شێوە لە مەراسیمەکەدا وێنەم گرتووە.

گــوتم:بڕیاربێ،هــەموو ســاڵێ لــەم یادەدا،شــەوێ لای تۆوشــیلان بمێنینەوە.

شیلان گوتی:زۆر خۆشحاڵ و گەورەدەبین.

هیوا گوتی: فیلمەکە تەواو.

گوتم: دەست خۆشبێ. سبەینێ هەموو فیلمەکان، هەر لە میسرەوە تا ئــەم مەراســیمەی ئــەوڕۆ.بــە هونەرمەنــدێکی کارامــە لــە بــواری مۆنتــاژ دەسپێرم تا باشترین فیلمی ڕاستەقینە و بەڵگەدار بەرهەم بێنێ.

## (٣١)

یەك مانگ لە پاش سالْیادی ئەنفال، لە ژووری فەرمانگەکەم دانیشتبووم ، تێلیفۆنم بۆ کرا، لە لایەن هونەرمەندی مۆنتاژەکەوە.

گوتی:فیلمەکەم تەواوکردووە، زۆریش بە هێز و بە پێز دەرچووە.

گوتم:دەتوانی بۆم بێنی؟

گوتی: سبەینێ هەینییە، شوێنێ دیاریکە ، لە کاژێر ٢ی پاش نیوەڕۆ دێم، تا فیلمەکە پێکەوە ببینین.

گوتم:هەر لە مالْی ئێمە کۆدەبینەوە، چونکە حەزدەکەم، کچەکانیش بانگێشتکەم، تا ئەوانیش فیلمەکە ببینن.

گوتی: زۆر چاکە، بە نیازی دیداریی سبەینێ لە کات و شوێنی دیاریکراو، مالآوا.

گوتم:منیش بۆ سبەینێ لە چاوەڕوانیی بەڕێزتم. بە خوات ئەسپێرم. ڕاستەوخۆ پێوەندییم بە هەموو کچەکانەوە کرد، کە سبەینێ لە مالْی ئێمە کۆببنەوە.

## (٣٢)

**ڕۆژی هەینی بوو، ماڵمان قەرەباڵغ بوو، هەموو لە چاوەڕوانییدا بووین. لە کاژێر ٢ی پاش نیوەڕۆ،لە دەرگا درا.ئەوین بە پەلە چوو کردییەوە،کە هونەرمەندەکە هاتە ژوورەوە،ویستم کچەکانی پێبناسێنم.**

**گوتی: کاک بڕیار،پێویست ناکات، هەموویان دەناسم، زۆر لە لای من خۆشەویست و پیرۆزن.**

**گوتم: لە دڵسۆزیی خۆتە.**

**گوتی: لە کام ژوور دەتانەوێ فیلمەکە ببینن، بەڵکو بە زوویی پێشکەشتانی دەکەم،چونکە زۆر پەلەمە و کاری دیکەم بە دەسەوەیە.**

**چووینە ژوورەکەم و دەسیپێکرد، هەموو تەماشامان دەکرد،زۆر بە هێمنی گوێمان گرتبوو، هەر لە میسرەوە دەسیپێکردبوو، کە گەیشتە خۆفڕێدانی شەهید (زارا) لە هێلیکۆپتەرەکەوە، پەڵمە و لوشمەی گریان و ئەشك ڕژان دەسیپێکرد.**

**گڕ و بڵێسەی مەشخەڵی دەسی کچانی ئەنفال، کۆتایی فیلمەکە بوو.**

**گوتم: دەستخۆش،بە ڕاستی فیلمێکی بەڵگەدار و ڕاستەقینەت لێ بەرهەمهێناوە،بەڵام دڵنیابن ئەمە کۆتایی فیلمەکە نییە، کچانی دیکەی ئەنفالکراوی فرۆشراویی زۆرمان ماوە، پێویستە لیژنەی بە دواداچوون، ڕۆڵی خۆیان ببینن، ئەندامەکانی، وولات بە وولات ویڵبن و بگەڕێن تا کچانمان بگەڕێننەوە باوەشی نیشتمان.**

بڕیار بیّ ئەم فیلمە، هەر سبەینیّ شەش دانەی لیّ کۆپی بکەم و پێشکەشی ئەم کچانەی بکەم،پاشان دانەییّ بۆ وەزارەتی مافیی مرۆۀ و دانەیەکیش بۆ وەزارەتی ڕۆشنبیریی، بەشی ڕاگەیاندن و بلاّوکردنەوە. تا لە لایەن ئەوانەوە و لە کاتی شیاودا، بە ناوی فیلمی (ویّلّ)وە، پەخشکریّ، تا پیرۆزیی و قارەمانێتیی کچانی کورد بە هەموو جیهان پێشاندا، وە هەموو ئەو وولاّتانەی هاوکاری ڕژێمیان کردووە لە کارەساتی ئەنفالی بەدناو،بدرێنە دادگای نێو دەوڵەتی و دادگایی بکرێن سەبارەت بە پێشێلییان لە مافیی مرۆۀ و مافیی ڕەوای گەلەکەمان.

**کۆتایی**

